• بەرچاڤکێن پارێزیێ بکە بەرچاڤێن خوٚ هندی تو دتاقیگەهێدا بی و فێری بکارئینانا چاڤ شویێ ببە

**سلامەتی ژ کیمیامەنیان**

• چ ماددەکێ کیمیایی د تاقیگەهێدانە بخوٚ نەڤە خوٚ نەتامبکە دشووشەمەنی و ئامانێن تاقیگەهێدا، بیکەر، نەپەرداغە بوٚ تەیێن هەلماندنێ، نەدوٚلکن .
• کیمیامەنیێن بکارئینای چ جارانە زڤڕینە وی ئامانێ تە ژێ ئینایی.
• هندەك کیمیامەنی ب زیانن بوٚ ژینگەهێ ژبەر هندێ دشێن ژینگەهێ ژێ بپارێزین دیڤچوونا رێنمایێن گونجایی بوٚ رزگاربوون ژ پاشماییێن ماددێن کیمیایی.
• باشترە بیکەر و بوٚرییێن تاقیکرنێ ئەوێن کیمیامەنی تێدا نیشان بکەین.
• ماددان برێکا مژینێ نە ڤە گوهێزە (مژوٚك یان لەڤەنێ تەزیاتیان) بەلکو بکارهێنانا تروپایا پلاستیکی یا بێ ترس ڤەگوهێزە.
• چ جار شووشەمەنی و ئامانێن کیمیامەنیان یان هەر تشتەکێ دی نە دانە ل سەر لێڤا مێزا تاقیگەهێ. نەکو بکەڤتە خوارێ.

**ماددەیێن داخکەر**

• دەمێ ئەو ماددە ڤبەر پیست یان جلك یان چاڤی بکەڤیت ئێکسەر ئاڤێ پێداکە و بێژە ماموٚستایێ خوٚ.
• دەمێ ماددەکێ کیمیایی درژیتە ل سەر ئەردێ تاقیگەهێ یان مێزێ، ماموٚستایێ خوٚ پێ ئاگەهدار بکە بەری توٚ پاقژبکەی هەتا ماموٚستایێ تە موٚلەتێ ددەتە تە.

**سلامەتیا گەرمکرنێ**

• دەمێ گەرمکرنا ماددەکێ کیمیایی دبوٚرییەکا تاقیکرنێدا دەڤێ بوٚرییێ ژ خوٚ و ئەوێن دیێن د تاقیگەهێدا دووربکە (ئەڤەژی رێسایەکا دی یا نوییە).

**رێنمایێن ماددەیێن سوٚژەك**

• شلێن سوٚژەك ب برێن کێم بکاربینە.
• پشت ڕاست بە کو کەسێ ئاگرێ بەنزن نەهەلکریە، پشت ڕاست ببە ژ ڤەمراندنا ژێدەرێن گەرمییێن دی.

**سلامەتیا دەستان**

• هەمی گاڤا دەستگورك یان بەردەستکی بکاربینە دەمێ بوٚریا شووشەی ب گەرمییێ دبڕی یان دچەمینی و بەردەستکێ ژ ژێدەرێ ئاگرێ دووربکە.
• بوٚریا شووشەی ب هێز نەکە د بوٚریا لاستیکیدا یان قەباغێ تە پە دوٚری و لاستیکیدا و بوٚ پاراستنا دەستێ خوٚ دەستگوٚرکێن چەرمی یێن ستوور بکە دەستێ خوٚ یان خاولییەکێ ب شووشێ بپێچە قەپاغێ یان تەپە دوٚری بوٚریا شووشەی هێدی بکە تێدا.
• هەکو بوٚریا تاقیکرنێ بکاردئینی گاسکێ بکاربینە و بوٚرییێ بدەستی نەگرە دەمێ گەرمکرنێ.
• هەمیگاڤا شووشێ دانە هەتا ستردبیت پاشی بکاربینە.

**سلامەتی د شووشەمەنیاندا**

• شووشەمەنیان بەری و پشتی بکارئینانێ د زڤرینی، ماموٚستایێ ئاگەهداربکە ئەگەر هندەك شکەستی یا دەرزی بن دا کو بکار نەئینن.
• شووشەمەنیێن شکەستی ب دەستێ رویس هەلنەگرە و شووشەمەنیێن شکەستی بکە د سەلکا تایبەتیا هاڤێشتنا شووشەمەنیاندا .

**ئاموٚژگارییێن هەلم و گازێن هەلچوی**

• هەلما ماددێن کیمیایی نەهەلکێشە هەکەر ژ تەهاتە خازتن تشتەکی بهێن بکەی، دەستێ بکاربینە بوٚ لڤاندنا هەلمێ بەرەڤ دفنا خوٚ و کێمترین برا پێدڤی هەلکێشە.

**ئاموٚژگارییێن تیشکەدانێ**

• هەمیگاڤا دەست گورکێ بکاربینە دەمێ تو سەرەدەرییێ دگەل ژێدەرێن تیشکدار دکەی.
• بەرچاڤکێن خوٚ دەمێ تو تاقیکرنەکا تایبەت ماددێن تیشکدار بجهدئینی.
• هەمیگاڤا دەستێن خوٚ هەتا ئەنیشکێ باش بشوٚ پشتی تو ماددێن تیشکدەرێن چالاك بکاردئینی.

**پویتەدان ب سلامەتی و ساخلەمیێ**

• دەستێ خوٚ ژ روی و دەڤێ خوٚ دووربکە.
• هەکو تە هەر ئێك ژ نیشانێن سلامەتیێ دیتن، 29 رێسا بینە بیرا خوٚ کو پێدڤیە ل تاقیگەهێ ل سەر بچی.
• هەمیگاڤا هەردوو دەستێن خوٚ بشوٚ بەری تو ژ تاقیگەهێ دەرکەڤی.

# نیاسینا کیمیامەنیان

بەرهەڤکرنا کارت و کارتێن پێڤەنیساندێ بۆ نیاسینا ئامانێن ماددێن کیمیایی و گیراوان و ئامیران ژ کارێن فەرە کو دبیتە ئەگەرێ بجهئینانا کارێ دروست د هەر تاقیگەهەکا زانستیدا نیساندنێن گونجای وان ڕوودانا کێم دکەت کو ژئەنجامێ خراب بکارئینانێ ڕوودەن، ژبەر هندێ پێدڤیە ئەو نیساندنێن نیاسینێ و ڕێنماییێن بکارئینانا ئامێران بەری بکارئینانێ چەند جارەکان بهویری بخوینین هەروەسا پێدڤیە پشت ڕاستبی کو تو ماددێ دروست بکاردئینی و دزانین چەوان بکاردئینی و تە پێزانینێن هەین ل سەر هەمی مەترسی و ڕێنماییێن پەیوەندی ب کارئینانا وانڤە هەین پێدڤیە کیمیامەنیا و بۆتلێن شووشەیێن گیراوان ب شێوەکی دیار و ڕاست بنیاسین، ئەو ماددێن بکاردئینین بۆ نیاسینێ کیمیامەنە کارتێ نەکەن، پێدڤیە نیساندنێن کیمیایی ئەڤ زانیاریە تێدابن .

1. **ناڤ و شێوگێ ماددێ کیمیایی**.
2. **بسالۆخەتدانا مەترسیێن دبیت ژێ پەیدابن**، بکارئینانا پەیڤا ڕێنما دەربڕینێ ژێ دکەت وەك پەیڤا ترسناك DANGER یان هشیاربە WARNING ، یان ئاگەهداربە CAUTION ودگەل ڤان کلیلا ڕێنمایاناندا چەند پەیڤەکێن دی دگەل دانە، کو جۆرێ مەترسییا پێشبینیکری دیاردکەت، وەك : ژەهر POI-SON ، سۆژەك CAUSES BURNS ، پەقۆك EXPLOSIVE ، سووتەك FLAMMABLE ، پشت ڕاستبە ژ هندێ کو پێڤە نیساندی ل سەر لیستا وان زانیاریان دانایە، کو تایبەتن ب وان ماددێن کیمیایی ڤە.
3. **ڕاپیکارێێن پارێزکاریان**: بەحسێ چەوانیا خۆ پاراستنێ ژ زیانا وان مەترسیان دکەت کو ل پێڤەنیساندی ڤە ئاماژە بۆ کریە، بۆ نموونە « تنێ ب هەبوونا هەوا گوهۆڕکێ گونجای بکاردهێت» یان « نەهێلە ڤبەر چاڤ و پیست و جلکا بکەڤیت».
4. **ڕێنماییێن پەیوەندیدار ب بارێ بەرکەڤتن و ڤێکەڤتنێ**. ئەگەر بەرکەڤتن و ڤێکەڤتنا پێشبینی نەکرییا ماددەی ڕوی دا، تاناهاتنا دەسپێکی گرنگ دبیت دکێمکرنا زیانێدا، بۆ نموونە ل بارا ڤێکەڤتنێدا ، ئەوی جهی ب بڕەکا زۆر ئاڤێ بشۆ، ئەگەر ماددە چو د چاڤێ تەدا ب ئاڤا پاقژا حەنەفیێ بۆ دەمێ 15 خولەکان بشۆ و ئێکسەر داخوازا هاریکاریا نوژداری بکە.
5. **ڕۆژا ئامادەکرنێ و ناڤێ کەسێ ئامادەکار** ئەڤ زانیارییە یا گرنگە بۆ دروست بکارئینانا ماددەی.

| خشتەك بۆ پێڤە نیساندنێن نیاسینا پێشنیازکریان | | |
|---|---|---|
| ناڤێ ناڤەڕۆکێ | ترشێ هایدرۆکلۆریك | |
| | 6MHCI | شێوگێ کیمیایی و خەستی و دۆخێ فیزیایی |
| سالۆخەتێ وان مەترسیێن دبیت پەیدابکەت و ڕاپیکارێێن پارێز | هشیاربە! ماددەکێ سۆژەك و داخۆر و داخکەرە .<br>هشیاربە! خوبپارێزە و نەکەڤیتەسەر پیست و چاڤێتە<br>و هەلما وی نەهەلکێشە | |
| | ل دەمێ کەفتەسەر ئێکسەر چاڤ یان پیستی ب بڕەکا ئاڤا زۆر بشۆ بۆ دەمێ 15 خولەکان ب کێمی بۆ چاڤان ئێکسەر ژی داخوازا هاریکاریا نوژداری بکە. | ڕێنماییێن مەترسیێ ل دەمێ بەرکەفتنەکا دیاریکری یان بەرکەفتنەکا دەم درێژ |
| ڕۆژا ئامادەکرنێ یان دانەڤێ | 8 ئایار 1989 ،ئاراس هەلۆ قوتابخانا ئامادەییا نەوروز کوردستان | بەرهەم ( ئامادەکرنا بازرگانی) یان دروستکرنا خۆمالی. |

# تەكنیكا (هونەركاریا) تاقیگەهێ

شێوێ (ج) شێوێ (ب) شێوێ (أ)

**ڕوونكاری (ڕۆكاری) ( DECANTING ) و ڤەگوهاستنا( TRANSFERRING )شلان.**

1. سلامەترین ڕێك بۆ ڤەگوهاستنا شلی ژ بۆریەكا پلەدار بۆ بۆرییەكا تاقیكرنێ، دشێوێ (ا) دا دیاركری. شله دهێتە ڤەگوهاستن ب درێژكرنا دەستی و پیچەك چەماندنا ئەنیشكێ، دڤی باریدا ئەو تشتێ تو دكەی دشێی ببینی و هەمیگاڤا ب ڕێكی بكەی.

2. هندەك جارا شلان هویركوكێن تواوەیێن (حەلیایی) ڕەق تێدا دبن كو دبنێ بۆریا تاقیكرنێ یان بیكەری دا دبیتە ڕەملتە، ئێك ژ ڤان ڕێكێن ل خوارێ بكاربینە بۆ جوداكرنا شلێ ڕوونێ هاتیە (پالاوتن) پارزتێن ( Supernatant) ژماددێ ڕەقێ نەتواوە.

أ. دشێی شلەكێ دناڤ بۆریەكا تاقیكرنێ دا ڕوونكاری بكەی، كو ڕوببكەیە بۆریەكا دی یا تاقیكرنێ، وەك ل شێوێ (ب) دا دیاركری.

ب. شێوێ (ج) ڕێكا دروست یا ڕۆكاریا شلی ژ بێكەرەكی ب بكارئینانا شیشكەكا شووشەی، پێدڤیە شیشكا شووشەی ب دیوارێ بێكەرێ وەرگرڤەبیت، شووشەی بەرامبەر لێڤا بیكەرێ ئەوێ هاتیەپارزین تێدا بگرە، كو ڕوی دكەی، ئەوێ پارزنی ب ڕەخێ شیشكا شووشەی دا دهێتە خوارێ ل بنێ بیكەریدا كومدبیت ب ڤێ ڕێكێ مسۆگەر یێ پارزنی نارژیت ب هەردوو لایێن وی بیكەری دا كو یێ پارزنی ژێڤەگوهێزین گەرمكرنا ماددان و هەلماندنا شلان.

## گەرمكرنا مادداں و هەلماندنا شلان

شێوێ (د)

1. شووشەمەنییێن گونجای هەلبژێرە بۆ گەرم كرنێ د پلا بلند اندا زۆردا، ئاگەهـ ژ هندێ بی كو شووشەمەنی جۆرێ دژی گەرمیێ ( پایرێكس) بن.

2. دەمێ بكارئینانا ئاگری گازێ بۆ گەرمكرنا شووشەمەنیان تۆرەكا نزایی( ژ ناڤدا حەزەف) ب كاربینە بۆ پاراستنا شووشەی ژ ڕاستەوخۆ كەفتنە بەر ئاگرێ گەرمكەری تۆڕاكانزای، بەرگریا پلێن گەرمیا زۆر بلند دكەت و ناهێلیت شووشە بشكێن شێوێ (د) ڕێكا گونجاییا هەلماندنا شلان ب بكارئینانا گەرما ڤێ دیار دكەت.

**.3** د هندەك تاقیکرنان دا ، پێدڤی دکەت، ماددان د پلا گەرمیا بلند دا د بۆتەکا ژ پۆرسلینی دروستکری گەرم بکەین شێوێ(هـ) پێکهاتنا ئامێری بکارهاتی بۆ ئەڤێ مەبەستێ دیار دکەت .

**.4** شێوێ(و) پەسندترین پێکهاتا هەلماندنا شلەکی کو دەرێ وی ب شیووشەکێ دەمژمێرێ داپوشییە دا کو رێ ل پرچکێن شلەی بگریت.

**.5** هوسا بۆتە دیاردبیت ، کو شووشەمەنی و پۆرسلێن و ئەو بابزنێ ئاسنی دکەڤیتە بەرگەرمکرنێ، د سارن، پشتی تو ژ دەرێ گەرمییێ دوير دئێخی بەلێ ئەڤ ماددە هێشتا دشیایادا پیستێ تە بسوژن هەتا بۆرینا چەند خولەکەکا ژ وی د سەر سارکرنا واندا، کاسك ( Tongs ) و هەلگرێ بۆرێین تاقیکرنێ ( Test Tube Holders ) یان دەست گۆرکێن ژدی گەرمییێ ( Mitss ) و پاتێ ستوير ( Pads ) بۆ هەلگرتنا ڤان ئامانایە.

**.6** دشێی پلا گەرمیا بیکەریان هەلگرێ بابزنەیی یان تۆڕا کانزایی یان هەربەشەکێ ئامیرەکێ تاقیکەی، ب نزیکرنا پشتا دەستێ خۆ ل رووییێ ماددەی هەولاهەستپێکرنێ بکەبەری ئامێرێ گەرم ب دەستە بکری دەست نەکێ و دەمێ پێدڤی بدیێ بلا سار ببیت بەری تو بکاربینی.

## چەوانا شلەکی ڕوییدکەی ژ کەمۆڵا گیراوەی

**.1** پێڤەنیسیاییێ ئاسینێ، سێ جارا بخۆینە بەری ئاڤڕۆکا کەمۆڵێ گیراوەی بکاربینی.

**.2** چ جار قەپاغێ گیراوەی، ل سەر مێزێ نەهێلی.

**.3** ل دەمێ شلەکێ داخکەری یان داڕۆژی ڕوی بکەیە بیکەرەکی، شیشکەکا شووشەی بکاربینە دا کو پرچك ژێ نەپەشن و نەرژیت.

شیشکا شووشەی بەرامبەر لێڤا کەمۆلێ گیراوەی بگرە، برا ئەوی شلێ پێدڤی بخەملینە بکە و ئەوژێ برێ ڕوییکە و شیشکا شووشەی ل سەر لێڤا بیکەری نەلڤینە، سەحکە شێوێ (ز)

4. پێدڤیە گەلەك ب هشیاری ڕەفتارێ دگەل کەمۆلێ ترسان بکەین وپێدڤیە بیرا خۆ بینیە ئەڤان ڕێسایان: چ جار ئاڤێ نەکە سەر ترشەکێ خەست و ب تایبەت ترشێ گوگردیك چونکە تێکەل گەرمیەکا زۆر پەیدا دکەت و دبیت پرچك ژێ پەشن هەکو تێکەل بکەی . ژبۆ رونکرنا ترشی، ب برێن کێم کێم بکە دناڤ ئاڤێدا و بهێدی ب لڤینە، هەمیگاڤا ل بیرا نە بیت، ترشی بکەیە دناڤ ئاڤێدا نە بەروڤاژی.
5. ڕوییێ دەرڤەیێ کەمۆلەی بپشکنە داکو پشت ڕاست بی کو دلۆپێن شلێ رویکری پێڤەنینن یان نەرشتیە سەر مێزێ و مامۆستاییێ تە باشترین ڕێکا پاقژکرنا کیمیامەنیێن ڕشتی دێ بۆ دیارکەت.
6. کیمیامەنیێن بکارئینای نەڤەگێرە ئامانێن وان و مامۆستاییێ تە دێ تە فێرکەت ل دویماهیا دەمێ تاقیگەهێ دێ چەوا خۆ ژماددێن کیمیاییێن زێدە رزگارکەی؟

## دێ چەوان ماددەیەکی گەرمکەی دبۆریا تاقیکرنێ دا

1. پشتراستبە کو بوری دژە گەرمیە.
2. هەمی گاڤا بگرێ یان گاسکێ بکاربینە دەمێ تو بۆریەکا تاقیکرنێ گەرم دکەی.
3. دەرێ بۆرییێ بەرامبەر کەسەکی نەبیت، چونکو دبیت پرچکێن نیڤا وی ڤەپەشنە دەرڤەی بۆرییێ.
4. چ جارا نەسەحکەیە ناڤ بۆرییێ هەکو گەرم دکەی.
5. بۆرییێ ژ سەری بوو خوارێ گەرم بکە دگەل بەردەوام لڤاندنا بۆرییێ، وەك د شێوێ (ح) دا دیارە گەرمکرن د خالەکا بۆرییێ دا نەبیت چونکو پەستانا زێدە دبیتە ئەگەرێ پەقینا بنێ بۆرییێ.

## چەوان هاونی و دەسکێ هاونی دێ بکارئینی؟

1. پێدڤیە هاون و دەسکێ وی بۆ هێرانا ماددەیەکی هەر جارەکێ بکاربینی سەحکە شێوێ (ط)
2. هاون و دەسکێ وی بۆ هێرانا چەند ماددەیەکا د هەمی دەمێ دا بکار نەئینە.
3. ئەو ماددێ تە دڤێت بهێزی بکە د هاونی دا.
4. ماددەی ب دەسکێ هاونی موکوم بگڤێشە و دستارکی بادە و بهێرە.
5. ماددێ هێرای ب کەڤچکەکێ خەزەفی ( پورسالین )بینەدەر.

## ڤەدیتنا بێهنا گازان

1. بێهنا گازا تاقی بکە ب لڤاندنا لەپێ دەستێ خۆ ل سەر دەڤێ بۆرییێ دگەل خەلکێشانا بەردەواما وێ هەلما ژێ بلند دبیت، هەروەك د شێوێ (ی) دا دبینی.
2. چ جارا هەلمان ئێکسەر هەلنەکێشە.
3. ژوورا گازا بکاربینە دەمێ بلندبوونا گازان یان هەلمێن ژەهر یان بەرهەست، و گازێن ژەهر هەلنەکێشە.

شێوێ (ی)          شێوێ (ط)          شێوێ (ح)

# شرۆڤەکرنا کێشیێ (سەنگ)

رێکێن شرۆڤەکرا کێشیێ پشت ب پیڤانێن هویر و رێك یێن بارستەی دبەستن و ئەڤ رێکە بۆ دیارکرنا برا ئاوێتیێ یان تۆخمی بکاردهێت، یان رێژا سەدییا هەر ئێك ژوان د هەر نموونەکا دیاریکری دا، بۆ نموونە ئەگەر مە ڤیا رێژا سەدییا ئاسنی د دارشتەیەکیدا یان رێژا سەدییا کلۆری د ئاڤاڤەخوارنێدا دیار بکەین، رێکا شرۆڤەکرنا کێشیێ بکاردئینین .

ب گشتی رێکا شرۆڤەکرنا کێشیێ پویتەی ب کارلێکرنا نموونەیەکێ بۆ پێکهاتنا بەرهەمێ کارێکێ دکەت بۆ دیارکرنا بارستیێ توخمی یان ئاوێتەی د نموونا بنچینە دا بکاردهێت. بۆ نموونە بۆ دیارکرنا رێژا سەدییا ئاسنی د نموونا دارشتەیدا بارستیێ ئەوی دارشتەی دهێتە دیارکرن، و پاشی دارشتەی د ترشیێ هایدرۆکلۆریکدا دێ حەلینین بۆ پێکئینانا $FeCl_3$ و پاشی بۆ شێوێ ئاوێتیێ $Fe_2O_3$ ب تێکرنا ئاڤ و ئامۆنیا و پێکئینانا $Fe_2O_3$ یێ بێ ئاڤ و تێکەلی دێ پارزنین بۆ ژێ جوداکرنا $Fe_2O_3$ یێ ئاڤی، و دیڤدا $Fe_2O_3$ یێ ئاڤیێ ل بۆتەکا خەزەفیدا دێ هێتە گەرمکرن بۆ هەلماندا ئاڤیێ و پێکئینانا $Fe_2O_3$ یێ بێ ئاڤ ، بارستیێ ئەوێ بۆ تەییێ و ناڤەرۆکا وێ دێ هێتە دیارکرن پشتی بجهئینانا چەند پێنگاڤێن دویڤئێکێن گەرمکرنێ بۆ دەستەبەرکرنا گەهشتنا بارستەکێ جێگیر، پشتی پشت راستبوون ژ هندێ کو هەمی ئەوا دناڤ ئامانێدا یا بویە هەلم دا کو پشتی هینگێ بارستیێ $Fe_2O_3$ یێ بەرهەمهاتی بکاربینی د هژمارتنا بارستیێ ئاسنی و رێژا سەدییا د وێ نموونێدا .

بۆ دەستکەفتنا ئەنجامێ راست، پێدڤیە ئاگەهداری ئەڤان ژێدەرێن شاشییێ بی د کریارا شرۆڤەکرنا کێشیدا:

1. دبیت بەرهەمێ نیشتوییێ پەیدا بودی پاقژ نەبیت.
2. دبیت هندەك ژ بەرهەمی بەرزەبیت دەمێ ڤەگوهاستنێ ژ پارزنینگەهێ بۆ بۆتەییێ.
3. دبیت بۆتەیا بەتالٚ نەیا پاڤژ بیت یان بارستیێ وێ یێ جێگیرنەبوو.
4. سیستەم ل دویڤ پێدڤی نەهاتیە گەرمکرن دا کو بەرهەمەکێ بێ ئاڤ بدەست کەڤیت.

**رایکارێن سلامەتیێ**

**بەردەوام بەرچاڤکێن پاراستنێ بکە بەرچاڤێن خۆ، و بەرکۆشێ بکە بەرخۆ بۆ پارستنا چاڤ و جلکێن خۆ.**

**دەمێ چرایێ بەترن بکاردئینی جلکێن فرەھ و شەپەشۆر بگرێدە.**

**چ جار شووشێن شکەستی نەهاڤێژە دسەلکا گلێشی یا ئاساییدا.**

## بەرهەڤکرن و گرێدانا ئامیران

شێوێ (أ)

1. پێکهاتەیێ بکاردئینایی دگەرمکرنا نموونەیا دناڤ بۆتەیا خەزەفیدا د شێوێ (ا) دا دیارکری بازنەکێ کانزایی ل سەر هەلگرەکێ کانزایی گرێدە و سێگۆشەکا خەزەفێ دانە سەر بازنێ.

## پاقژکرنا بۆتەیا خەزەفی

2. بۆتەیێ بشوو، چ خەزەف یان کانزابیت، دگەل قەپاغی و هشك بکە، بۆ تەیێ دگەل قەپاغی بکێشە دا بارستە بدەست تە بکەڤیت. ئەگەر تە رازی یا دویر بوو، گرەیێ بۆتەیێ بکاربینە دا بۆتەی ب قەپاغێڤە دانییە سەر تۆرا کانزایی، تۆرا کانزایی بکاربینە (وەك سێنیەکێ) بۆ گەهاندنا بۆتەیێ بۆ سەر تەرازیێ .

شێوێ (ب)

## گەرمکرنا بۆتەیێ بۆ دەستکەفتنا بارستەکێ جێگیر

3. پشتی نڤێسینا بارستێ بۆتەیێ و قەپاغێ وێ ل پێشیێ بۆتەیێ ل سەر سێگوشا خەزەفی جێگیربکە ل سەر ئاگری بەنزین هەروەك دیار د شێوێ(ب)دا پاشی قەپاغی دانە سەر.

شێوێ (ج)

4. ئاگری هەلکە و بۆتەیێ بۆ دەمێ 5 خولەکان ل سەر ئاگرەکێ هێدی گەرم بکە بەری تۆ ئاگری خۆش کەی دا کو ئاگرەکێ بهێز پەیدا بکەی بۆ دەمێ، 5 خولەکێن دی گەرم بکە پاشی کلیلکا گازێ بگرە، و بۆتەیێ و قەپاغی بهێلە هەتا سار بن، گرەی بکاربینە بۆ هەلگرتنا بۆتەیێ و قەپاغی بۆ تەرازیێ، هەروەك دیارە د شێوێ(ج) دا. بارستەی بپیڤە و بنڤێسە. ئەگەر خواندنا بارستەی جودا بوو ژ ئەوا بەری گەرمکرنێ، کریارێ دووبارەبکە هەتا جوداهی دناڤبەرا هەردوو خواندنا دا ببیتە % 1 . ب ڤێ چەندێ دێ دانین کو بارستێ بۆتەیێ جێگرە و بەرهەڤە بۆ بکارئینانێ د کریارا شرۆڤەکرنا کێشێدا. و دێ هویرکاریا د تاقیکرنێن بهێت دا بینی.

ناڤ ........................................ بەراور ........................................ پۆل ........................................

# تاقیکرنا 1

# دیاریکرنا شێوگێن ئاوێتێن ئایۆنی

## نیشانێن پراکیتیکی

- **سەرنجا** کارلێکێن پێگوهۆڕینا کیمیایی دکەت.
- **بکارئینانا** پیڤانا بۆ دیارکرنا شێوگێ ماددێ کیمیایی.
- **کارپێکرنا** تێگەهێن ژمێریارییێن کیمیاییێن ل سەر کارلێکێ هاتینە دانان.

## دەستپێك

کیمیاگەر ئاسایی پێکهاتنا ماددێن نەدیار ب ئەگەرێ تێبینیا ڕێکا کارلێکرنا وان دگەل ماددێن پێکهاتنا وان دیار دکەن و ڕێکا بەربلاڤ کارلێکێن پێگوهۆڕینییە کو بڕەکا پیڤایی ژ ماددەکێ دیار کارلێکێ دکەت دگەل ماددەکێ نەدیار.

دڤێ دیڤچوونێدا شێوگێن هەردوو خوێیێن کانزایی دیار دکەت ئێك ژڤان دوو خوێیان ئەو کلۆریدێ مسی یە کو دێ دیارکەت کا ئەو کلۆریدێ مسی (I) ە یان کلۆریدێ مس (II) بیت، و خوێیا دووێ ئەو کلۆریدێ ئاسنی یە کو دێ دیارکەت کا ئەو کلۆریدێ ئاسن (II). یان کلۆریدی ئاسن (III) بیت ؟

ئەو کارلێکا دێ بکارئینی ، کارلێکا پێککگوهۆرینا دووانیە دگەل هایدرۆکسیدێ سۆدیۆم NaOH ، ئاڤەگیراویێ هەر ئێك ژ ئایۆنێن ئاسنی و مسی ڕەملتیێ پێك دئینن دەمێ دگەل ئایۆنێن $OH^-$ د ئاڤەگیراوەیدا ئێك دگرن .

فینۆلفثالین، ناسەرەوەکە، ڕەنگێ پیڤازی یان سۆر پەیدا دکەت ب هەبوونا ئایۆنێن $OH^-$ دگیراوێ کارلێك نەکری دا، و بکاردهێت بۆ زانینا ب دوماهی هاتنا کارلێکێ، دەمێ چ توخمەك نەبیت کارلێکێ بکەت دگەل ئایۆنێن $OH^-$ یێن کرینە بەر، ئایۆنێن $OH^-$ دێ بنە ئەگەرێ دەرکەفتنا ڕەنگێ پیڤازی یان سۆر .

## سلامەتی

**بەرچاڤکێن پارێزیێ بەردەوام بکە بەرچاڤێن خۆ و بەرکوشا تاقیگەهێ بکە بەر خۆ بۆ پارستنا چاڤ و جلکێن خۆ.**

**دەست نەکە چ ماددەکێ کیمیایی. ئەگەر دەست یان جلکێن تە ڤبەرکەڤتن ، بشو و مامۆستای پێ ئاگاداربکە .**

**دەمێ هەر ماددەکێ کیمیایی درژیت گازی مامۆستایێ خۆ بکە.**

## مادده‌و ئامیر

- 0.1 M كلۆریدێ مس.
- 0.1 M كلۆریدێ ئاسن.
- 0.1 M هایدرۆكسیدێ سۆدیۆم.
- 2 سینێن چه‌ند چالك ( 8 چالَ)
- 4 دلۆپێنێن ب دمك.
- پێنفسێكێ نه‌خشه‌ كێشانێ.
- فینۆلفثالین.
- 10 زلكێن دادا پاقژكرنێ.

## ئاماده‌كرن

**1.** خشتێن زانیاریێن ل خوارێ بكاربینه‌ بۆ نڤێسینا هژمارا دلۆپێن NaOH بۆ هه‌ر ئێك ژ كلۆریدێ مس و كلۆریدێ ئاسن.

| خشتێ زانیاریا | كلۆریدێ مس | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| | 1 | 2 | 3 | 4 | 5 |
| هژمارا دلۆپێن NaOH | | | | | |
| | كلۆریدێ ئاسن | | | | |
| | 1 | 2 | 3 | 4 | 5 |
| هژمارا دلۆپێن NaOH | | | | | |

**2.** چوار دلۆپێنان بینه‌ و ئێك ل دویڤ ئێك ل سه‌ر بنڤیسه‌: Cu، Fe، NaOH ناسه‌ره‌وه‌.

## رێكاری

**1.** ئه‌و دلۆپێنا ب Cu ناڤكرى ب گیراوێ كلۆریدێ مسى پر بكه‌ و ئه‌و دلۆپێنا ب NaOH ناڤكرى ب گیراوێ هایدرۆكسیدێ سۆدیۆم پڕ بكه‌.

2. ب بکارئینانا سێنیا 8 چالْ ، 5 دلْۆپێن گیراوێ کلۆریدێ مس بکە د هەر چالکێن ئێکێ دا و ئەنجامێن باشتر ب دەستکەڤن دلْنیا بە کو قەبارێ دلْوپان نزیکە هندی ئێکن.

3. ب بکارئینانا دلْوپێنا ب ناسەرەوە ناڤکری، دلْوپەکا ناسەرەوێ فینولفثالین بکە د هەر ئێك ژ پێنج چالاْن دا. هەر وەك د شێوێ (أ) دا دیارە.

4. دلْوپ دلْوپ گیراوێ هایدرۆکسیدێ سۆدیۆم بکە دناڤ چالاْ ئێکێ، گێراوێ د چالێدا ب زلکی تێکڤەدە پشتی تێکرنا هەر دلْوپەکێ هەر وەك د شێوێ (ب) دا دیارە. بەردەوام NaOH ، بکێ هەتا ڕەنگێ پیڤازی یان سۆرێ ناسەرەوێ فینۆلفثالین دیار ببیت.
گوهۆڕینا ڕەنگی گرۆڤە یە کو هەمی کلۆریدێ مسی کارلێك کر. هژمارا دلْۆپێن NaOH یێ کریە سەر بنڤێسە د خشتێ زانیارێن کلۆریدێ مسی دا. ب هەمان ڕێك دلْوپێن NaOH بکە سەر هەرچوار چالێن مایین. و ئەنجامان بنڤێسە بۆ تێکڤەدانا گێراوێ هەر چالەکێ زلکەکێ نوی بکاربینە.

**شێوێ (ب)** دلْوپەکا NaOH بکە سەر پاشی گیراوەی تێکڤەدە. گوهۆڕینا ڕەنگێ گیراوی بۆ پیڤازی ئانکو هەمی ماددێ کلۆریدێ مس کارلێك کر.

**شێوێ (أ)** دلْوپەکا فینۆلفثالین بکە هەر چالەکێ ژ چالێن سێنیا کلۆریدێ مسی تێدا، پێدڤیە هندی د شیاندابیت قەبارێ دلْوپان نزیکی ئێك بن.

5. دلْۆپێنا ب Fe ناڤکری پر بکە ژ کلوریدێ ئاسن، پاش پێنگاڤێن ڕێکا کاری ژ 1 هەتا 4 دووبارە بکە ب بکارئینانا سێنیەکادیا 8 چالْ . ، گیراوێ کلۆریدێ ئاسن ژ پێش گیراوێ مس. د خشتێ زانیارێن تایبەت ب کلۆریدێ ئاسنی ڤە هژمارا دلْوپێن هایدروکسیدێ سۆدیۆمێ NaOH دکەیە سەر هەر ئێك ژ پێنج چالاْن بنڤێسە بۆ دەستکەفتنا گوهۆڕینا ڕەنگی .

## پاقژکرن و قورتالبوون ژ پاشەڕۆیان

1. جهێ کاری د تاقیگەهێدا پاقژبکە، هەمی ئامێرین تاقیکرنێ پاقژبکە و بزڤرینە جهێن وان. خۆ ژ کیمیامەنیان و گیراوان ڕزگاربکە و پاڤێژە د جهێ تایبەتێ مامۆستای بۆ دیارکری. چ ماددێن کیمیایی نەرێژە د دەست شوێ دا. چ تشتەکی نەهاڤێژیە دسەلکا گلێشیدا ئەگەر مامۆستای نەگۆتبیت. پشتی تۆ کاری تەمام دکەی دەستێن خۆ باش بشوو بەری تۆ ژ تاقیگەهێ دەربکەڤی.

## شرۆڤەکرن و ڕاڤەکرن

**1. ڕێکخستنا هزران:** هاوکێشا هاوسەنگا کارلێکا پێکگوهۆڕینا دووانی دناڤبەرا هایدرۆکسیدێ سۆدیۆم و هەر ئێك ژ ڤان بنڤێسە.

أ. کلۆریدێ مس (I)　　　ج. کلۆریدێ ئاسن (II)

**ب.** کلۆریدێ مس (II)　　　**د.** کلۆریدێ ئاسن (III)

**2. ڕێکخستنا هزران:** دبیت تە سەحکربیت کو هەر ئێك ژ گیراوێن بکارئینای 0.1 mol یەکە یا شێوگێ تێدایە بۆ هەر لیترەکێ ژ گیراوەی. و ئەگەر و سادانین کو هەمی دلۆپ ئێك قەبارەنە، چەوان دێ هژمارا یەکەیێن شێوگی د دلوپا هەر گیراوەکیدا بەراور دکەی؟

**3. ڕێکخستنا زانیاریان:** ناڤەندێ هژمارا دلۆپێن NaOH یێ پێدڤی کارلێکێ دگەل کلۆریدێ مس بکەت چەند؟ د ناڤەندێ هژمارا دلۆپێن NaOH یێ پێدڤی کارلێکی دگەل کلۆریدێ ئاسنی بکەت چەندە؟

## بۆ دەرکەڤتنێن گشتی

**1. پێکڤەگرێدانا هزران:** ب هاریکاریا بەرسڤێن تە د شرۆڤەکرن و ڕاڤەکرنا پرسیارێن 2 و 3 و هژمارا یەکەیێن شێوگێ NaOH یێن پێدڤی کارلێکێ بکەن دگەل هەر یەکەیەکا شێوگێ کلۆریدێ مس د تاقیکرنێدا دیاربکە. هژمارا یەکەیێن شێوگێ NaOH یێن پێدڤی کارلێکێ بکەن دگەل هەر شێوگەکێ کلۆریدێ ئاسنی ؟

**2. گەهشتن بۆ دەرکەڤتنان:** بەرسڤاتە بۆ پرسیارا پێشیێ دگەل هاوکێشا کیمیاییا هاوسەنگا باسکری د بەشێ ( شرۆڤەکرن و ڕاڤەکرن) دا بەراورد بکە. کیژ ژ کلۆریدێ مس یان ئاسن د گیراوێن تە بکارئینانیدا هەبوو ؟

**سەرپار**

**1. هەڵسەنگاندنا ڕێکان:** ئەگەر تە زانی کو بەهایێ پەسەند بۆ هژمارا دلۆپێن NaOH 10 دلۆپن دا ب تەمامی کارلێکێ دگەل کلۆریدێ مس بکەن. ب هاریکاریا ئەو ئەنجامێن تۆ گەهشتییێ ڕێژا سەدییا شاشییێ بینەدەر .

---

---

---

---

ناڤ .................................................. بەروار .................................................. پۆل ..................................................

## تاقیکرنا 2

# دیاریکرنا شێوگێ سەرەتاییێ ئۆکسیدی مەگنیسیۆم

### نیشانێن ڕابیکاری

- بارستێ ئۆکسیدێ مەگنیسیۆمی **داپیڤیت**.
- کارلێکا ئێککگرتنێ بکارئینانا شرۆڤەکرنا کێشێ **بجهدئینیت**.
- شێوگێ سەرەتاییێ ئۆکسیدێ مەگنیسیۆمی **دیاردکەت**.

### دەست پێك

شرۆڤەکرنا کێشێ دڤێ تاقیکرنێدا پێدڤی ب سوتنا توخمێ مەگنیسیۆمە دهەوایدا بۆ پێکئینانا ئۆکسیدێ مەگنسیۆم هەیە ، و بارستێ بەرهەمهاتووی دێ پتر بیت ژ بارستێ مەگنسیۆمێ بکارئینای ژبەر ئوکسجینێ ئێککگرتی دگەل توخمێ مەگنسیۆمی. هەروەکی شرۆڤەکرنێن کێشێ یێن دی، سەرکەفتنا ئەڤێ شرۆڤەکرنێ گرێدایە ل سەر ڕێژا داهاتیا بەرهەمێ ب دەستکەفتی کا چەند نزیکە ژ 100% . ژبەر ڤێ چەندێ پێدڤیە بەرهەمی گەرم بکەین و سار بکەین. و دووبارە دێ پیڤین هەتا هەردوو بارستە یێن بەرهەمی یێن پیڤاین نزیکی ئێکتربن جوداهی دناڤبەرا واندا 20% نەبۆریت. و دەمێ بارستێ هەر ئێك ژ کارلێکریان و بەرهەمهاتوویان ب هویری پیڤین. دێ دشیانا مەدابیت بڕا ئوکسجینێ بکارهاتی د کارلێکێ دا بینینەدەر. وێ گاڤێ دێ شێین ڕێژا ئوکسجینی بۆ مەگنیسیۆمی زانین، و پاشی داریکرنا شێوگێ سەرەتاییێ ئوکسیدێ مەگنسیۆمی.

### سلامەتی

**بەردەوام بەرچاڤکێن پارێزیێ بکە بەرچاڤێن خۆ و بەرگوشی بکە بەر خۆ بۆ پارستنا چاڤ و جلکێن خۆ.**

**دەست نەکەیە هەر ماددەکێ کیمیایی. وئەگەر کەفتە سەر دەست یان جلکێن تە بشوو ماموستایێ خۆ بێ ئاگاداربکە.**

**دەمێ تۆ ئاگرێ بەنزن بکاردئینی، جلکێن شەپەشۆر گرێبدە.**

**شووشێن شکەستی چ جار نە هاڤێژە دسەلکا بەرمایکێن ئاساییدا.**

## مادده و ئامیر

- بۆرییەکا تاقیگەهێ یا پلەدارا قەبارە 10 mL
- شەریتەکا مەگنیسیۆمی درێژیا وێ 15 cm بیت.
- چرایێ بەنزن.
- سێگۆشەکا خەزەفی.
- بۆتەیەکا خەزەفی دگەل قەباغێ وێ.
- ئاڤا دلۆپاندی.
- دلۆپینەکا چاڤان یان مژوکەکا بچووک.
- هەلگرەکێ بازنەیی.

## ئامادەکرن

**1.** زانیاریان د خشتەییێ ل خوارێدا بنڤێسە.

| خشتەییێ زانیاریان | |
|---|---|
| | ئەنجامێن کۆمەلێ |
| 1. بارستێ بۆتەییێ و قەپاغێ و توخمێ (g) | |
| 2. بارستێ بۆتەییێ و قەپاغێ و بەرهەمێ (g) | |
| 3. بارستێ بۆتەییێ و قەباغێ (g) | |

## ڕێکا کاری

**1.** هەلگرێ بۆتەییێ دانە سەر چرایێ بەنزن هەروەک دشێوێ (أ) دا دیارە.

**2.** بۆتەیێ و قەپاغا وێ بۆ دەمێ 4 دەقیقەدا گەرم بکە بۆ سوتنا هەر خلتەکێ تێدابیت.

**3.** بۆتەیێ و قەباغا وێ ساربکە هەتا پلا گەرمیا ژووری، بارستێ وان بپیڤە و درێژا 3 یا خشتەیدا بنڤێسە.

**تێبینی:** بۆتەیێ و قەباغا وێ ب بگرە یەکێ تایبەت بگرە، ئەو دەستێ تە ژ سوتنێ د پارێزین و ناهێلیت خلتە و پیستێ دەستێ تە بۆ بهێنە ڤەگوهاستن.

شێوێ (أ)

4. شریتا مەگنیسۆمی ب لیفکێ کانزایی بهسە چونکو دڤێت مەگنسیۆمیێ تەیسۆك بیت هەروەك د شێوێ (ب) دا دیار. شریتێ ببرە بۆ پارچێن بچووك دا کو کارلێکێ لەزتر لێبکەت، پاشی وان پارچان بکە بۆتەییدا.

شێوێ (ب)

5. بۆتەییێ دا پۆشەو بارستێ بۆتەییێ قەباغی و ماددەی بپیڤە، و پیڤانا وێ ژ رێزا 1 ێ د خشتێ زانیاریاندا بنڤێسە.

6. گرەی بکاربینە بۆ ڤەگەراندنا بارێ بۆتەییێ لسەر سێگۆشە خەزەفی. پیچەك بۆتەیا دا پۆشی گەرم بکە، پاشی پیچەك قەباغی بلند بکە دا بهێلین هەوا بچیتە دناڤدا، هەروەك دیارە د شێوێ (ج) دا .

شێوێ (ج)

شێوێ (د)

**هشیاربە**: ڕاستەوخۆ نە سەحکە شەریتا مەگنسیۆمی.

7. دەمێ کارلێکا شریتێ تەمام دبیت، قەپاغێ بۆتەییێ پێچەك ڕاکە و بەردەوام بە ل سەر گەرمکرنێ بۆ دەمێ دەقیقەکا دی.

8. ئاگری ژبن بۆتەییێ ببە، و پشتی بۆتە ساردبیت هێدی چەند دلۆپێن ئاڤێ بهاریکاریا دلۆپێنەکا چاڤان بکە سەر، هەروەك دیار دشێوێ (د) دا، بۆ لێکهەلوەشاندنا هەرنیتریدەکێ دبیت پەیدا ببیت.

**هشیاربە**: هشیاربی دەمێ دلۆپێن ئاڤێ دکەیە سەر، چونکو ئەگەر گەلەك بوو دێ بیتە ئەگەرێ دەرزینا بۆتەییێ.

9. قەپاغێ بۆتەییێ باش بگرە. ئاگری دانەبن بۆتەییێ و بۆ دەمێ 30 بو 60 چرکا گەرم بکە.

10. ئاگری ڤەمرینە، بۆتە و ناڤەرۆکا وێ و، قەپاغی ساربکە بۆ پلا گەرمیا ژووری. بارستێ بۆتە و قەپا غ و بەرهەمی بپیڤە. پیڤانێ دخشتێ زانیاریاندا بنڤێسە.

## پاقژکرن و قۆرتال بوون ژ بەرمایکان

**11.** بارێ بۆتەی و ناڤەرۆکا وێ و قەپاغی ڤەگەرینە سەر سێگۆشا خەزەفی و دووبارە گەرم بکە بۆ دەمێ دوو دەقیقان. ساربکە بۆ پلا گەرمیا ژوورێ، و جارەکا دی بارستێ بۆتە و قەپاغ و ناڤەرۆکان بپیڤە، ئەڤێ پیڤانا بارستەی دگکەل ئەوا پیڤای د پێنگاڤا 10 دا بەراوردبکە. ئەگەر بارستێ پیڤایێ نوی نزیکی بارستێ پیڤانێ پێنگاڤا 10 دا بوو ب برا 0.02% بارستێ نوی د رێژا 2 ێ د خشتێ زانیاریاندا بنڤێسە. و ئەگەر هەردوو پیڤان نزیکی ئێك نەبوون ئەڤە نیشانا هندێ یە کو هێشتا کارلێك تەمام نەبوویە. ئەڤێ پێنگاڤا دووبارەبکە.

**1.** ئۆکسیدێ مەگنیسیۆمێ رەق بهاڤێژە د سەلکەکا تایبەتا بەرمایکان، و هەر پارچەکا شریتا مەگنسیۆمێ بکارنەئینای بزڤرینەڤە بۆ مامۆستایێ خۆ. ئامێر و جهێ تاقیکرنێ پاقژبکە. دەستێن خۆ باش بشو پشتی تاقیکرن ب دوماهی دهێت و ئامێرو و جهی پاقژبکە.

## شرۆڤەکرن و راڤەکرن

**1.** **کارپێکرنا هزران**: بارستێ توخمێ مەگنیسیۆمی وبارستی بەرهەمهاتی بینەدەر.

---

**2.** **هەلسەنگاندنا زانیاریان**: بارستێ ئوکسجینێ کارکری دیاربکە.

---

**3.** **بجهئینانا هزران**: هژمارا مولێن مەگنسیۆمی و هژمارا مۆلێن ئوکسجینێ د بەرهەمی دا بینەدەر.

---

## بۆ دەرکەڤتنێن گشتی

**1.** **بەلگەپێدانا پەیوەندیان**: شێوگێ سەرەتاییێ ئۆکسیدێ مەگنیسیۆمی $Mg_xO_y$ دیار بکە .( رێژا مۆلْ دابەشی مۆلێن مەگنسیۆمی بکە، چونکو ئەڤ بەهایە ژ برا پیڤانا یا وەرگرتی ژ پێش برا ئینایە دەرڤە).

---

---

ناڤ ........................................ بەروار ........................................ پۆل ........................................

## پرۆژێ زانستی

# بدیڤداچوونا باشی یا ئاڤێ د نموونێن جودا یێن د ژینگەها فێرخوازی ادا

### ئارمانجا پرۆژەی

- **گەشە بە** کارامەییا ڤەکۆلینێن زانستی ددەت.
- **رێگا زانستی** بکاردئینیت بۆ پلانا ڤەکۆلینەکێ و بجهئینانا وێ .
- **ئاریشەکا ژینگەهێ** دەستنیشان دکەت و کار بۆ چارەکرنا وێ دکەت.

### نیشانەکانی ڕاییکاری

- **پابەندە** ب پێرابوونێن سلامەتییێ د دەمێ کارلێکرنێدا د تاقیگەهێدا.
- **نموونان** ژ ئاڤێ ب رێکا دروست کومدکەت.
- **نەخشێ** چەند تاقیکرنەکا دکێشیت بۆ پیڤانا پیکهاتێن ئاڤێ .
- **زانیاریێن بنچینەی** ل سەر رەنگێ ئاڤێ و پلا شلبوونا وێ و پلا گەرمیا وێ دپیڤیت و د نڤیسیت.
- **توانا هایدرۆجینی** ( PH )یا نموونەیەکا ئاڤێ دپیڤیت.
- **پلا گەهاندنا کارەبێ** E.C یا نموونەیەکا ئاڤێ دیاردکەت.
- **دگەهیتە وێ برا** خویێ رەق یا حەلیای TDS Total Dissolved Solids
- **خەستیا ئایونێ کلۆریدی** $Cl^-$ ی دیار دکەت.
- **پلا سویراتیێ** Salinity ژ خەستیا کلۆریدی نیشانددەت.
- **ناسازی یا گشتی** Total Hardness ب چەند رێکەکا دیاردکەت.
- **لە چەند جهێن زانستیدا** ل سەر تورێ دگەریت دا کو بگەهیتە رەوشێن پیڤانەیی د باشی یا ئاڤێدا.
- **ڕاددا باشیا** نموونێن کومکرین ل دویڤ رەوشتێن جیهانی و خوماڵی دیاردکەت

### دەست پێك

خودێ د سوورەتا «الأنبياء 30 » دا دبێژیت

وَجَعَلْنَا مِنَ الْمَاءِ كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ أَفَلَا يُؤْمِنُونَ ﴿٣٠﴾

ئەڤ نیعمەتا مەزن، نهێنییا ژیانێ ئێك ژ ئەگەرێن سەرەکی یێن پەیدابوونا شاریستانیانە، هەروەسا ئەگەرەکێ پەیدابوونا شەڕ و هەڤڕکیابوو، ژبەر کو هەر جهەك و دەڤەر و لایەك پێدڤی ب ئاڤێیە، پێدڤیە وەك فێرکاری کیمیایێ، پتر ژ ڤێ گرفتاریێ نزیك ببین، بەلێ نە تەنێ ژ لایەنێ سۆز و لایەنگریا ئارێشێڤە بەلکو بزاڤێ بکەین بۆ ڤەدیتنا چارەسەریێ.

### جۆرێن نموونێن ئاڤێ

نموونێن ئاڤا سەر رویێ ئەردی ئەڤەنە:

1. ئاڤا سەرئەرد : د گۆم و دەیاچە و روبار و دەریا دا هەیە و پشکنینێن خولی یێن ژینگەهی بو دهێنە کرن، دا کو دلنیابین ژ پیس نەبوونا وان.

2. ئاڤا بن ئەرد (ئاڤا بیران): ئەوژی پشکنینا ژینگەهی بۆ دهێتەکرن بۆ دیارکرنا شیانا بکارئینانێ بۆ ڤەخوٚران وئاڤدانێ.

3. ئاڤا ڤەخوٚرانێ : دهێتە داگرتن یان ب بوٚریا دگەهینە مالان و پشکنین بۆ دهێنەکرن دا کو پشت ڕاست بن ژ ڕاددا گونجانا وێ دگەل ڕەوشتێن پێدڤیێن باشی یێ.

4. ئاڤا پیس : یان ئاڤا پیسا پیشەسازییە ( پاشە ڕوٚیێن کارگەهان) یان ئاڤا چوٚکایە، دهێتە پشکنین بەری و پشتی چارەکرنێ، بۆ دیارکرنا شیاندنا چارەکرنێ یان شیانا بکارئینانێ بۆ ئاڤدانێ پشتی چارەکرنا وێ.

5. ئاڤا بارانێ : دهێتە پشکنین بۆ نیشاندانا ڕاددێ، پیسبوونا هەوای د دەڤەرێدا (بارانا ترش یان پیسکەرێن دی).

تێبینی: د دەمێ بجهئینانێ دا، هەلبژارتنا نموونان ژ هەر سێ جوٚرێن ئێکێنە.

## وەرگرتنا نموونا ئاڤێ

ل دەمێ وەرگرتنا نموونا ئاڤێ چاڤدێریا ئەڤێن ل خوارێ بکە.

1. بۆ کومکرنا نموونان ئامانێن پلاستیکی بکاربینە.

2. دەستنیشانکرنا وی جهێ نموونێ ژی هاتیە وەرگرتی و نڤێسینا بەروار و دەمی ل سەر پیڤەنیساندی.

3. دیارکرنا ئەو کویراتیا نموونە ژێ هاتیە وەرگرتن . و نابیت نموونە بهێتە وەرگرتن ژ ڕەخ و رویێن ژێدەری ئەو ڕووەکێن ئاڤی وکەفز تێدا کومبووین و هەلاویستییێن ڕەق.

4. نموونا ئاڤا بیرێ دهێتە وەرگرتن بکێمی پشتی نیڤ دەمژمێرێ ژ کارپێکرنێ و هەروەسا نموونا ئاڤا حەنەفیێ پشتی چەند دەقیقەکا دهێتە وەرگرتن ( بۆ خوٚ پاراستن ژ حەستیا زوٚرا ئاسن و مسێ دبوٚرییێن کانزاییدا کومبووی هەکو حەنەفیا گرتی).

5. گەلەك گرنگە ئێکسەر شروٚڤەکرنا نموونان بهێتەکرن دەمێ دگەهنە تاقیگەهێ و ئەگەر نەهاتنە شروٚڤەکرن بهێنە پاراستن د ئامانێن پلاستیکیدا د فریزەرادا د پلا گەرمیا 4°C دا.

## ئەو شروٚڤەکرنێن بۆ ئاڤێ دهێنەکرن

ئەو پشکنینێن بۆ ئاڤێ دکەین چەند جوٚرەکن کو ئەڤەنە:

1. **پشکنینێن فیزیایی** ئەڤ پشکنینە باراپتر د وی جهی دا دهێتەکرن ( ئەو دەمێ نموونە کومکری) وەك پلا گەرمییێ و پلا شیلبوونێ Turbidity و ڕەنگی.

2. **پشکنینێن کیمیایی** وەك:

– توانا هایدروٚجینی pH : حەستیا کاتایوٚنێ هایدروٚجینن $H^+$ پێ دئیننەدەر و پلا ترشێتیا ئاڤێ دیاردکەت ب ئامێری pH پێڤی.

– گەهاندنا کارەبێ E.C ElectricConductivity دهێتە پیڤان ب تێپەرکرنا تەزوویەکێ ئەرك نزم دناڤبەرا دوو جەمسەراندا، و پاش بەرگریا ئاڤێ دێ پیڤین ئەوێ بەرگرێ دێ وەرگێرین ب ئومێ ( Ohms ) بۆ گەهاندێ ب موس ( Mohs ) یان ب یەکێن بچووکتر ئەوژی میلموٚهە ( Milimohs ) و پەیوەندیەکا راستەوانە هەیە دناڤبەرا پلا گەهاندنا یا ئاڤێ و ئایونێن تێدا تمامە. ئەڤە دێ مەگەهینیتە ئەوا هاتیە زانین ب پیڤانا ماددێن رەقێن ب تەمامی تواوە ( TDS ).

– ماددەیێن ڕەقێن ب تەمامی حەلیای TDS Total Dissolved Solids : کو دشێن یان ڕاستەخۆ ب هاریکاریا دەزگای ( وەك ئێك ژ دەربرینێن گەهاندنا کارەبێ E.C ) بینینەدەر ، یان برێکا نەراستەوخۆ ب پالاوتنا نموونا ئاڤێ ب ئاڤ پارزنینێ گونجای ( پالێوێن ڕێشالێن شووشەی باشترە) ب هەلمبوونا ئاڤا هاتیە پارزنین د پلا $180°$ C دا.
ئەو زێدەهیا د کێشێ ئامانێ بەتالدا دیار دبیت ئەو ماددەیێن ڕەقێن تەمامی حەلیاینە TDS و بە g/L دەردبریت.

– تەخمینکرنا سویراتییێ Salinity : ئێك ژ گرنگترین دەربرین بۆ وێ، تەخمینکرنا خەستیا ئانایۆنێ کلۆرید $Cl^-$ ێ حەلیای د ئاڤێدایە. و ئەڤەژی ب رێکا تێکرنا برێن پێدڤی ژ نیتراتێ زیڤی یە (0.2 mol/L)و پشتی ڤێ دێ تەکنیکا شرۆڤەکرنا کێش بکارئینین بۆ دیارکرنا بارستێ کلۆریدی د نموونێدا.

– ناسازیا گشتی Total Hardness :ئەگەرێ هەبوونا کاتایۆنێن کالیسیۆم و مەگنیسیۆم د ئاڤێدا دبنە ئەگەرێ ناسازیا ئاڤێ. ئەڤ کاتایونە باراپتر ژ ئاخێ یان کەڤرێن هویر بووی د ئاڤێدا تێکەلی ئاڤێ دبن، و د شیاندایە ناسازیا ئاڤێ ب رێکێن تاقیگەهی وەك شرۆڤەکرنا کێش بپیڤین. و ئەژی ب نیشاندنا ئەڤان کانایۆنان ب تێکرنا برەکا پێدڤی ژگیراوێ 0.02 mol/L $Na_2CO_3$ ، پاشی پارستێ نیشتووی پشتی هشکرنێ بینینەدەر ( و لڤێرێ هوسادانین نیشتووتنێ کاربوناتێ کالیسیۆمە).

ناڤ ........................................ بەروار ........................................ پۆل ........................................

# تاقیکرن 3 ڕێنیشاندانا ڕوودانا کارلێکا کیمیایی

## نیشانێن ڕاپیکاری

- **تێبینیا** ئەوان گۆڕینێن ڕوودانا کارلێکا کیمیایی نیشاددەن.
- **تێبینیان** ژ بۆ دەرکەڤتیت کو ماددەکێ نوی پەیدابووە.
- **پێوەندیا** دناڤبەرا گەرمی و کارلێکا کیمیایی دیاردکەت.
- **وەسفا کارلێکا** دکەت ب نڤیسینا هاوکێشا کیمیاییا هاوسەنگ.
- **جۆرێ** کارلێکا کیمیایی دیار دکەت.

## دەستپێک

ئێك ژوان ڕێکێن کو هاریکاریا تە دکەن کو بزانی کارلێکەکا کیمیایی ڕوودایە، ئەو تێبینیەیە کو ڕەوشتێن ماددێن بەرهەمهاتی جودا ژ ڕەوشتێن ماددێن کارلێکری، و دبیت ماددێ بەرهەمهاتیێ نوی بگوهۆریت بۆ ماددێ کارلێکری د کارلێکەکا کیمیاییا دی دا. دێ دڤێ تاقیکرنێدا زنجیرەکا کارلێکان بینی ڕوودەدەت د گیراوێ نیترانیێ مس (II) دەمێ دزنجیرەکا کارلێکێن جودا دا دبۆریت، ئەڤ هەمی کارلێکە د هەمان بۆریا تاقیکرنێدا ڕوودەدەن. و د هەر پێنگاڤەکێ دا دێ ل وان گروڤان گەری کو نیشان ددەت ماددەکێ نوی پەیدا بوویە ئەنجامێ کارلێکێن کیمیایی. هەروەسا دێ تێبینیا گوهۆرینێن گەرمیێ کەی و بەراورکەی دگەل کارلێکێن کیمیایی. هەروەسا دێ ئەو کارلێکێن هەر جارەکێ ڕوودایین ل دویڤ ئەوێن تە خواندین پۆلێنکەی.

## سلامەتی

**بەردەوام بەرچاڤکێن پارێز بکە بەرچاڤین خۆ و بەرکوشیێ بکە بەرخۆ بۆ پاراستنا چاڤ و جلکێن خۆ.**

**دەست نەکە هەر ماددەکێ کیمیایی. و ئەگەر کەفتە سەر دەست یان جلکێن تە بشوو مامۆستایێ خۆ پێ ئاگاهداربکە.**

**دەمێ هەر ماددەکێ کیمیایی دسۆژیت گازی مامۆستایێ خۆبکە.**

**دەمێ تو ئاگرێ بەنزن بکاردئینی . جلکێن شەپەشۆر گرێ بدە.**

**شووشێن شکەستی چ جار نە هاڤێژە د سەلکا پاشەڕۆێن ئاساییدا.**

## مادده‌و ئامێر

- 1.0 M نیتراتێ مس (II)
- 1.0 M HCl
- 1.0 M NaOH
- ئامانه‌ك قه‌باره 100 mL
- تێله‌كا ئه‌لومنیوٚم درێژیا 12 cm
- ئاگرێ به‌نزن وتشتێن وێ
- توولەكا شیشەی بوٚ تێكڤه‌دانێ
- ئه‌لقه‌كا ئاسنی
- پێنڤیسه‌كێ نه‌خشه‌كێشانێ
- گیره‌كا (گاسك) ئه‌لقه‌یی
- راسته
- بوٚریه‌كا تاقیكرنێ ( 13 mm × 100 mm )
- هه‌لگرێ بوٚرێن تاقیكرنێ
- توٚرێ كانزایی ب ناڤه‌ندا خه‌زه‌ف

## رێكا كاری

**.1** 50 mL ژ ئاڤێ بكه دناڤ ئامانێ قه‌باره 100 mL وگه‌رم بكه هه‌تا كه‌لینێ. ئه‌ڤ ئاڤا گه‌رم دێ ل پێنگاڤا 5 بكاردهێت.

**.2** هه‌تا ئاڤ گه‌رم دبیت، پێنڤیسی وراسته‌ی بوٚ وێنه‌كرنا سێ نیشانان ل سه‌ر بوٚریا تاقیكرنێ ب دویریا 1 cm بیت.
ده‌ستپێبكه ب دانانا نیشانان ژبنكێ بوٚریێ بوٚ سه‌ری.

نیتراتێ مس II

**.3** برەكێ ژ گیراوێ 1.0 M نیتراتێ مس (II) هه‌تا نیشانا ئێكێ بكه دناڤ بوٚریا تاقیكرنێ دا هه‌تا نیشا ئێكێ وه‌كی یا دیار ل شێوی(أ).

**شێوێ (أ)**

**.4** برەكێ ژ گیراوێ 1.0 M هیدروٚكسیدێ سوٚدیوٚم NaOH هه‌تا ئاستێ شلی بكه دناڤ بوٚریا تاقیكرنێ هه‌تا نیشانا دووێ وه‌كی یا دیار ل شێوێ(ب).

**هوشداری : هایدروٚكسیدێ سوٚدیوٚم مادده‌كه پێستی دخوٚت پاراستنێ و به‌ركوشكێ بكه‌ر ودویریه ژ به‌ر كه‌فتنا مادده‌ی ب پێستی یان ب چاڤان. و هه‌كه‌ر هه‌ر ئێك ژ هه‌ردووان مادده ڤێ بكه‌ڤیت ئێكسه‌ر ب ئاڤێ بشو و ئاگه‌هداریا ماموٚستایێ خوٚ بكه ب وێ چه‌ندێ.**

هایدروٚكسیدێ سوٚدیوٚم M 0.1

هه‌ردوو گیراوان تێكه‌ل بكه ب تولێ شیشه‌ی، پاشی باش ب ئاڤێ بشوٚ به‌ری دانیه سه‌ر مێزێ. ده‌ستێ خوٚبكه بنێ بوٚریا تاقیكرنێ دا ئه‌و هایدروٚكسیدێ مسێ( II ) و نیتراتێ سوٚدیوٚمه. ئه‌و گوهورینێن رویدای ل بوارێ دیاركری بوٚ وێ توٚمار بكه.

**شێوێ (ب)**

**تێبینی:**

هاوكێشا كیمیایی یا رویدانا كارلێكێ ل پێنگاڤا 4 بنڤێسه.

جوٚرێ كارلێكا به‌رێ چییه؟

---

---

---

**5.** بۆریا تاقیکرنێ دانە دناڤ ئەو ئاڤا گەرم یا ل پێنگاڤا 1 هاتیە ئامادەکرن( بەرهەمێ ڤێ کارلێکی ئەو ئۆکسیدێ مسێ (II) و ئاڤە) ئەو گوهورینێن رویدای ل بۆریا تاقیکرنێ دا تۆماربکە.

**تێبینی**:

---

هاوکێشا کیمیایا یا رویدای کارلێکێ ل پێنگاڤا 5 بنڤێسە دگەل دیارکرنا جۆرێ کارلێکێ.

---

جۆرێ کارلێکێ:

---

پەیوەندی دناڤبەرا جۆرێ کارلێکا بەرێ و بکارئینانا گەرم ئاڤێدا چییە؟

---

شێوێ (ج)

**6.** بۆریا تاقیکرنێ ژ ناڤ ئاڤا گەرم راکە. گرێ بەنزن ڤەمرینە، د کەشێ ژوورێدا، بۆریا تاقیکرنێ و ناڤەرۆکا وێ بۆ دەمێ دوو خوۆلەکان ساربکە. برەکێ ژ گێراوێ ( 1.0 M ترشێ هایدرۆکلۆریك)هەتا نیشانا سیێ بکە دناڤ دا، وەکی یا دیار ل شێوێ (ج).

**هوشداری: ترشێ هایدرۆکلۆریك ماددەکە پیستی دخۆت. بەرچاڤکێن خۆپاراستنێ و بەرکۆشکێ بکەیە بەرخۆ. دویربە کو ماددە نەگەهیتە سەر پێستی یان چاڤان. هەر وەسا دویربە ژ بێهن هەلکێشانا هەلّما ماددەی. هەکەر تشتەك ژڤی ماددەی رژتە سەر لەشێ تە، جهێ رژتیە سەر ئێکسەر ب ئاڤێ بشۆ و ئاگەهداریا مامۆستایێ خۆبکە.**

هەردوو گیراوان تێکەل بکە ب تولێ شیشەی، پاشی باش ب ئاڤێ بشۆ بەری ل سەر مێزی دانی. بەرهەمێ نوی ئەو کلۆریدێ مسێ (II) و ئاڤە، گوهورینا رویددەت د بۆریا تاقیکرنێدا تۆمار بکە.

**تێبینی** :

هاوکێشا کیمیایی هاوسەنگ بۆ رویدانا کارلێکێ ل پێنگاڤا 6 بنڤێسە دگەل دیارکرنا جۆرێ کارلێکێ.

---

جۆرێ کارلێکێ:

---

7. تێلەکا ئەلەمنیۆمی دانە دناڤ بۆریا تاقیکرنێ دا و بهێلە هەتا کارلێك رادوەستیت. دەستێ خۆ بکە بنکێ بۆریێ ژدەرڤەدا هشیاربە ژ پەیدابوونا گەرمێ. و ل ڤێرە دو کارلێك رویدەن و مسی و کلۆریدێ ئەلەمنیۆم ژێ پەیدا دبیت. هەروەسا ئەلەمنیۆم کارلێکی دگەل ترشێ هایدرۆکلۆریکی دکەت دا هایدرۆجین و کلۆریدێ ئەلەمنیۆمی پێك بینیت. گوهورینێن رویدەن ل بۆریا تاقی کرنێ دا تومار بکە.

**تێبینی** :

---

---

هاوکێشێن کیمیایێن هاوسەنگ بۆ رویدانا کارلێکێل پێنگاڤا 7 بنڤێسە.

---

---

ئەو جۆرێ کارلێکا رویدای چییە؟

---

8. تێلێ ژ بۆریا تاقیکرنێ دەربێخە. و بەروورديا مسێ پەیدابووی پارچەکا مسێ هەی دتاقیگەهها تەدا، و تێبینێن خۆ تۆماربکە .

---

---

## پاقژکرن و خۆ رزگارکرن ژبەرمایکان

9. هەمی ئامێران و جهێ کارێ خۆ دتاقیگەهێدا پاقژ بکە. ئامێران بۆ جهێن وان یێن سەرەکی ڤەگەرینە. خۆ رزگاربکە ژ ماددێن کیمیایی و گیراو د سالکێن تایبەتێن بۆ وان ئامادەکرین چ ماددێن کیمیایی نەرێژە یان پاڤێژیە د بۆرییێن سولینێ یان سەلکێن بەرمایکێن ئاسایی دا بێ رازی بوونا مامۆستای. باش دەستێن خۆ بشۆ بەری دەرکەفتنا ژ تاقیگەهێ و پشتی بدوماهی کاری.

## پرسیار

1. **رێکخستنا هزران** : ئەگەرێ کارلێکا کیمیایی چییە؟

---

---

2. **رێکخستنا هزران** : دو هۆگاران بێژە بەلگێ بۆ وان ددەت ل سەر رویدانا کارلێکا کیمیایی. و لایەنێن دیارکری ژ ڤێ تاقیکرنێ بێژە.

---

---

---

---

3. **زانیارییێن شیکارکری( شرۆڤەکری)**: هەمی ماددێن کارلێك و بەرهەم دڤێ تاقیکرنێ دا دیاربکە. توخم و ئاوێتان جودا بکە.

4. **رێکێن شیکارکرنێ**: چەوا دشێین کلۆریدێ ئەلومنیۆم ژ گیراوی جودا بکە؟

5. **ئەنجامێن بەلگەپێدای**: ئەرێ رەنگێ گیراوێن ئاوێتێن مسی چییە؟

6. **ئەنجامێن شیکارکری**: کیش ماددێن کارلێك کری د تاقیکرنێ دا شیانا بوهوژینێ د ئاڤێدا هەیە؟ وکیش ژوان د ئاڤێ دا نا بوهوژیت ؟

## دەرئەنجامێن گشتی

1. **زانیارییێن شیکارکری**: جۆرێن کارلێکێن کیمیاییێن رویداین ل وێ تاقیکرنا تە ئەنجام دای بێژە.

ناڤ ........................................ بەروار ........................................ پۆل ........................................

# تاقیکرنا 4 دیارکرنا چالاکیا ریژەیی بۆ هندەك كانزایان

## نیشانێن بجهئینانێ

- **نەخشەکێشانا تاقیکرنەکێ** بۆ دیارکرنا چالاکیا توخمان دکەت.
- **تاقیکرنا** بۆ دیارکرنا چالاکیا هندەك توخمان دکەت.
- **ریزکرنا توخمان** لدویڤ چالاکیا کیمیایی دکەت.
- **شارەزاییێن** کریارێن زانستیێ بکاردئینیت.

## پێشەکی

زنجیرا چالاکی ئەو لیستەکە، توخم تێدا لدویف چالاکیا وا یا کیمیایی ریزبووینە، و ئەڤ زنجیرە یا دیارە ، دناڤبەرا ئەنجامدانا کومەکا تاقیکرنێن بەری دا. لدەمێ پارچەکا کانزای دکەیە دناڤ گیراویێ کانزایەکێ دی تر چالاکی کێمتربیت، کانزاییێ چالاکی کێمتر دێ ل سەر پارچا کانزاییێ چالاکی پتر نیشیێت ( دێ کانزاییێ چالاکمی پتر جهێ کانزاییێ چالاکی کێمتر ئەوێ د نیشییێت گریت). د ڤێ تاقیکرنێدا، قوتابی رادبن ب نەخشە کێشان و کرنا کومەکا تاقیکرنان، و ل سەرئەنجامێن وێ دگەهنە چالاکیا ریژەیی بۆ ڤان کانزان، و ل وێ رادبن ب دروستکرنا زنجیرەکا بچویك بۆ چالاکیا کیمیایی بۆ ڤان کانزان.

## سلامەتی

**بەرچاڤکێن خۆ پاراستنێ و بەرکوشێ تاقیگەهێ بەردەوام بکە بەرخۆ دا پاراستنا چاڤ و جلکێن خۆ بکەی .**

**گازی مامۆستای بکە لدەمێ هەر ماددەکێ کیمیایی دریژیت.**

**دەست نەکە چ ماددێن کیمیایی، و هەکەر دەست و جلکێن بەرکەفتن، بشۆ و بێژە مامۆستاییێ خۆ.**

## ماددە ئامێر

- بۆریێن تاقیکرنێ
- پارچێن تۆتیا (زنك)
- پارچێن مس
- شریتێن مەگنیسیۆم

- گیراوە HCl 0.1 mol/L
- گیراوە $CuCl_2$ 0.1 mol/L
- گیراوە $ZnCl_2$ 0.1 mol/L
- گیراوە $MgCl_2$ 0.1 mol/L

## ئامادەکرن

**1.** ماددە و ئامێران بکاربینە ل نەخشەکێشانا کومەکا ژ تاقیکرنان، لدویڤ وی خشتیێ دهێت بهێتە پرکرن ✔ لدەمێ رِوودانێ کارلێك و نیشانەی ✖ لدەمێ رِوونەدانیدا.

| خستێ زانیاریان | | | | |
|---|---|---|---|---|
| گیراوە / کانزا | $HCl$ | $CuCl_2$ | $ZnCl_2$ | $MgCl_2$ |
| Zn | | | | |
| Cu | | | | |
| Mg | | | | |

## رێکاکاری

**1.** ب پشت بەستن ب ڤی خشتەی، هەر سێ کانزان ل رنجیرا چالاکییێدا رێزبکە، و جهێ هایدرۆجینی ل ڤێ زنجیرا بچویکری دا دیاربکە.

______________________________

______________________________

______________________________

## شیکارکرن و شرۆڤەکرن

**1.** **هەلسەنگاندنا هزران**: بۆ زنجیرا چالاکیا توخمان ل پەرتووکا خۆ بزڤرە، و دیارکرنا وێ زنجیرا تە ئامادەکری بکە ئەرێ راستە.

______________________________

______________________________

ناو .................................... رۆژ .................................... پۆل ....................................

# تاقیکرن 5 پەیوەندی دناڤبەرا بارستێ و مۆلێ دکارلێکێن کیمیاییدا

## نیشاندەرێن بجهئینانێ

- **کریارێن** پیڤانا بارستێ ب شارەزایی دزانیت.
- **ژمارا** مۆلێن کارلێکەر و بەرهەمان د کارلێکەکێدا ب تاقیکرنێ دەست نیشان دکەت.
- **پەیوەندیێ** دناڤبەرا بارستێ و مۆلێ بۆ کارلێکەکا کیمیایی د ژمێریاریانادا بکاردئینیت.
- **ژمارا پەیوەندی** ب چریێ ڤەهەبیت و ژمێریاریا کیمیایی دکەت.

## پێشەک

د ڤێ تاقیکرنێدا هەردەوو برێن کاربۆناتێ سۆدیۆمێ هایدرۆجینی و ترشی سیهێکا (ئستیك) ئەوا پێدڤی بۆ بەرهەمئینانا برەکا دیارکری ژ دوانۆکسیدێ کاربۆنی. ئەڤەژی ب کارلێکرنا بارستەکێ پیڤای ب هویری ژ ماددێ کارلێکێ $NaHCO_3$ دگەل سرکێ، و پاشی پیڤانا بارستێ بەرهەمێ $HC_3COONa$ تو دشێی د وی دەمیدا ژمارا مۆلێن ترشی سیهکا پێ هاتیە بکارئینان و ژمارێن مۆلێن $CO_2$ یێ بەرهەمێ دەست نیشان دکەت. و بکارئینانا پەیوەندیا مۆلێ دناڤبەرا کاددێن کارلێکەر و بەرهەمیداو تۆ دشێی ژمیریار بارستێ هەر ماددەکێ کارلێکەر و ژمارا مۆلێن وی پێن پێدڤی بۆ بدەستڤەئینانا قەبارەکێ دیارکری ژ $CO_2$ . بۆ دروستڤەئینانا قەبارێ $CO_2$ ژ بارستێ وێ، پێدڤی یە چریا $CO_2$ بزانی ئەڤەژی 1.52 g/L ل پلا گەرمییا ژووریدا.

## سلامەتی

بەردەوام بەرچاڤکێن خۆپاراستنێ و بەرکۆشکا تاقیگەهێ بکە بەرخۆ، هەتا جل و چاڤێن خۆ پارێزی.

دەستێ خۆ نەکە چ ماددێن کیمیایی و هەکەر ماددە ببەردەست و جلکێن کەفت بشۆ و بێژە مامۆستایێ خۆ.

لدەمێ ئاگرێ بەنزن بکاردئینی ، جلکێن شوور و بەرفرەه گرێدە.

چ جارێ شیشێت شکەستی نەکە د ناڤ سەلکا بەرمایکێن ئاسایی.

گازی مامۆستایێ خۆ بکە لدەمێ هەر ماددەکێ کیمیایی دڕژیت.

## مادده و ئامێر

- $1.0\ M\ CH_3COOH$
- $NaHCO_3$ g 2-3
- تەرازی
- دارەکێ گرتنا ئامانی(ماسك)
- دلۆپێنەکا چاڤان یان ڤرۆك
- تورەکا کانزایی ب ناڤەندا(حزف)
- ئامانەکێ هەلمکرنێ
- لوولەکا پلەدار
- هەلگرێ ئەلقەیی
- کەڤچك
- شیشەکا دەمژمێرێ
- گرێ بەنزن و پاشکوێن وی، یان گێزەرێ ئاڤێ.

ترشێ سەرکیك
$CH_3COOH$

## ئامادەکردن

**1.** خشتێ دهێت بکاربینە بۆ تۆمارکرنا زانیاریان.

| خشتێ زانیاریان | |
|---|---|
| 1. بارستێ ئامانی و شیشێ دەمژمێری | |
| 2. بارستێ ئامانی و شیشێ دەمژمێرێ و $NaHCO_3$ | |
| 3. بارستێ ئامانێ و شیشێ دەمژمێرێ و نیشتوویێ $CH_3COONa$ پشتی دەمێ گەرمکرنا ئێکێ. | |
| 4. بارستێ ئامانی و شیشێ دەمژمێرێ و نیشتوویێ $CH_3COONa$ پشتی دەمێ گەرمکرنا دووێ. | |

## ڕێگا کاری

**1.** بارستێ ئامانێ هەلمکرنێ یێ پاقژ و هشك و شیشێ دەمژمێرێ بۆ نێزیك ترین 0.01 g خواندنێ ل خشتێ زانیاریان تۆماربکە.

**2.** 2g هەتا 3g $NaHCO_3$ بکە دناڤ ئامانێ هەلماندنێ دا، پاشی بارستێ $NaHCO_3$ و شیشێ دەمژمێرێ و ئامانێ هەلماندنێ بۆ نێزیکی 0.01g و خواندنێ د خشتێ زانیاریان تۆماربکە.

**شێوێ (أ)** شیشێ دەمژمێرێ ب شێوێ بەرۆڤاژی(پارچا چال بۆ سەری) هاتیە دانان ل سەر ئامانێ هەلمکرنێ ئەوێ هاتیە دانان ل سەر چەقێ خەزەفی یێ تورا کانزایی.

**3.** هێدی 30mL ژ گیراوێ ترشێ سرکیك بکە دناڤ NaOH ئەو هەی ل ئامانێ هەڵماندنێ، بکارئینانا دلۆپێنا چاڤێ یان مژوکی ترشی زێدەتر بکەی هەتا پەقیشك رادوەستن.

**4.** هەکەر تۆ ئاگرێ بەنزن بکاردئینی ئامانێ هەلمکرنێ و ناڤەرۆکا وێ دانە ل سەر تۆرا کانزایی هاتیە دانان ل سەر هەلگرێ ئەلقەیی، وەکی ل شێوێ (أ) دیار دبیت. شیشێ دەمژمێرێ بەروڤاژی دانە ل سەر ئامانێ هەڵماندنێ دگەل ئەسەح بوونێ ژ هەبوونا کونەکا بچویك بۆ دەرکەفتنا گازێ، لدەمێ تو گێزەرێ گەرمێ بکاردئینی، ئەڤژی ب دانانا ئامانێ هەلمکرنێ ئێکسەر ل سەر لایێ گەرم.

5. ئامانێ هەڵماندنێ، گەرم بکە ب هێدی هەتا هشك دبیت و بەرمایکێن ڕەق و هشك دناڤدا دمینیت، پشت راستبە کو چیکێن ئاڤێ ب رەخێن شویشێ دەمژمێرێڤە نەمانە. ( ب لەز گەرم نەکە چونکی دێ بیتە ئەگەرێ کەلینا ناڤەدۆك و تێك چوونا بەرهەمی ب شێوێ پەر میشك و تەنوکان بۆ ژدەرڤەی ئامانێ هەڵماندنێ)

6. چرایێ ئاگرێ بەنزن ڤەمرینە ( یان هیتەرێ کارەبێ) ئامێران ب لایێ کێم ڤە 15 خوولەکان بهێلە ساربن، بارستێ ئامانێ و ناڤەدۆکێ و شویشێ دەمژمێری بۆ نێزیکترین 0.01 g پیڤە، بارستێ ئامانی و نیشتووی و شویشێ دەمژمێرێ ل خشتێ زانیاریان بنڤێسە.

7. هەکەر دەم هەبیت و ئامانێ هەڵماندنێ و تاڤەروکا شویشەی دوو خوولەکێن دی تر گەرم بکە، و بهێلە ساربیت، تۆ دشێی پشت راست بی ژ هشك بوونا نموونێ ل دەمێ دوو پیڤانێن ئێك ل دویڤ ئێك ژ بارستێن بدەست تە کەفتین د جودابن دناڤبەرا 0.02 g زێدەتر نەبن.

## پاقژکرن و رزگاربون ژ بەرمایکان

8. هەمی ئامێر و کەل و پەلان و جهێ تاقیگەهێ پاقژبکە و بکە دناڤ جهێن وان، ماددێن کیمیایی و گیراوان بکە دناڤ سەلکێن تایبەتێن کو مامۆستا دیاربکەن. چ ماددان نەهاڤێژە دناڤ دەست ئاڤێ دا هوتا مامۆستا دەرفەتێ نەدەتە تە، دەستێن خۆ باش بشۆ پشتی تەمام بوونا کارێ تەو دەرکەفتنێ ژ تاقیگەهێ.

## شیکار لێکدان

1. **ئەنجامێ شیکرنێ:** هاوکێشەکا هاوسەنگیا کارلێکا سۆدای (بیکاربۆناتێ سۆدیوم) دگەل ترشی سەرکیك بنڤێسە، ئەسەح بە ژ دۆخێن فیزیایی هەمی ماددێن کارلێکەر د بەرهەم هاتی.

______________________________________________

______________________________________________

2. **رێکخستنا زانیاریان:** بکارئینانا خشتێ خوولی بۆ ڤەدیتنا بارستێ موۆلێ هەر ئێك ژ ماددێن کارلێکردوو بەرهەم هاتی.

______________________________________________

______________________________________________

______________________________________________

______________________________________________

______________________________________________

______________________________________________

3. **شیکرنا ئەنجامان:** ل دەمێ کارلێك رویدەت، ئەگەرێ پەیدابوونا بلقێن گازێ؟

______________________________________________

4. **رێکێن شرۆڤەکرنێ**: چەوا دزانی کو ڕەقێ ڕەملتە ئەو هەمی ب ڕاستی، سەرکاتێ سۆدیۆمە و نە تێکەلێ ژ کاربۆناتێ سۆدیۆمێ هایدرۆجینی یە و سەرکاتێ سۆدیۆمە؟

5. **رێکخستنا زانیاریان**: بارستێ $NaHCO_3$ و ژمارێن مۆلێن $NaHCO_3$ و بارستێ $CH_3COONa$ و ژمارێن مۆلێن $CH_3COONa$ بینەدەرێ.

6. **هەلسەنگاندنا زانیاریان**: هاوکێشا هاوسەنگ و برا $NaHCO_3$ بکاربینە ، و داهاتێ تیۆری بۆ $CH_3COONa$ ب مۆلان و گرامان دیاربکە.

## دەرئەنجامێن گشتی

1. **شرۆڤەکرنا دەرئەنجامان**: ڕێژا سەدی یا داهاتی د کارلێکا خۆدا چەندە؟

2. **گەهشتنا دەرئەنجامان** : ئەرێ داهاتی تیۆری بۆ $CO_2$ چەندە؟ بهایێ چرییێ هاتی د پرسیارێدا بکاربینە ئانکو $1.25\ g/L$ قەبارێ $CO_2$ بەرهەم د کارلێکێدا بینەدەر. ژمێریاریێن خۆ ڕوون بکە.

3. **بجهئینانا دەرئەنجامان**: چەند مۆل ژ $NaHCO_3$ پێدڤی یە بۆ بەرهەم ئینانا $425\ mL$ $CO_2$؟ ژمێریاریێن خۆ ڕوون بکە.

ناو ........................................ رۆژ ........................................ پۆل

## تاقیکرن 6

# ژمێریارییێن کیمیایی و شرۆڤەکاریا کێشێ

### نیشانێن ڕاپیکاری

- **تێبینیێ** کارلێکا پێکگوهۆڕینا دوانی دناڤبەرا کلۆریدێ سترونتیوم و کاربۆناتێ سودیۆم دکەت.
- **تەکنیکێن** شرۆڤەکاریا کێشێ ب کارامەی ب کاردئینیت.
- **باراستێ** نیشتوویێ (رەملتا) پەیدابووی دێ پیڤیت.
- **باراستێ** نیشتوویێ پێکهاتی و باراستێ کارلێکرییان بەری کارلێکرنێ پێکڤەگرێدەدەت
- **باراستێ** کاربۆناتێ سۆدیۆمی دگیراوێ خەستێ نەدیاردا دپیڤیت

ئەڤ تاقیکرنا نهۆ یا شرۆڤەکاریا کێشێ پویتەی ب کارلێکا بێکگوهۆڕینا دوانی دکەت دناڤبەرا کلۆریدێ سترونتیۆم $SrCl_2$ کاربۆناتی سۆدیۆمی $Na_2CO_3$ . و ئەڤ جۆرێ کارلێکا ب گشتی بکاردهێت ب بۆ دیارکرنا بڕا کاربۆناتی دگیراوەیدا و بۆ دەست کەڤتنا ئەنجامێن هویر پێدڤیە هەموو کارلێککرێێن بڕا نەدیار بهێنە گوهۆڕین بۆ پێ بەرهەمهاتی. ئەگەر ب هویری باراستێ بەرهەمهاتی بپیڤین، دێ شێین ژمێریارییێن کیمیایی بکاربینین بۆ دیارکرنا بڕا کارلێککرییێ نەدیارێ پشکداری کری دکارلێکێدا، ئەنجامێن هویر پشت بەستن ب پیڤانا ڕێك یا باراستەی.ژبەر ڤێ چەندێ پاقژیا شووشەیان بپارێزە و هندی دشیاندابیت ژ هەربڕەکا کارلێکری یان بەرهەمهاتییێ وندادبیت کێم بکەی.

هەمی گاڤا بەرچاڤکێن پاراستنێ بکە بەرچاڤێن خۆ و بەرکۆشێ بکە بەرخۆ بۆ پاراستنا چاڤ و جلکێن خۆ

دەست نەدە چ ماددەیەکێ کیمیایی. و ئەگەر ڤبەرچاڤ و جلکێن تەکەفت، بشۆ و مامۆستایی پێ ئاگەداربکە.

## مادده و ئامێر

- 15 mL ی گیراویێ $Na_2CO_3$ خەستی نەدیار
- 50 mL ی گیراویێ $SrCl_2$ 0.30 M
- دووبیکەرێن 250 mL
- تەرازی
- بیکەرگر
- ئاڤا دلۆپاندی
- فرنەکا هشککرنێ
- کاغەزا پارزنینێ
- کوڤکەکا شووشەی
- لوولکەکا پلەدار
- شیشکەکا شووشەی بۆ تێکڤەدانێ
- دەستمالا کاغەزی
- کەڤچك
- شیشەکا شویشتنێ

## ئامادەکرن

1. ئەڤی خشتەیی بکاربینە بۆ نڤێسینا ئەنجامێن پیڤانان.

| خشتێ زانیارییان | |
|---|---|
| قەبارێ گیراویێ $Na_2CO_3$ کرییە بەر | |
| قەبارێ گیراویێ $SrCl_2$ یێ کرییە بەر | |
| بارستێ کاغەزا پارزنینێ | |
| بارستێ بیکەری دگەل دەستمالا کاغەزی | |
| بارستێن بیکەری دگەل دەستمالا کاغەزێ پارزنینێ و نیشتوو | |

2. ب ئاڤ و سابینێ هەمی ئامیرێن تاقیگەهێ یێن پێدڤی بۆ کاری بشۆ، خۆ ئەگەر دپاقژبوون. و پاشی هەر پارچەکێ ژ ئامیران ب ئاڤا دلۆپاندی بشۆ.
3. بارستێ کاغەزا پارزنینێ بپیڤە و نزیك بکە بۆ 0.01 g و د خشتێ زانیارییدا بنڤێسە.
4. دەزگەهێ پارزنینێ یێ بەردەست (یان پارزنین ب بەتالکرنێ یان پارزنین کێشی) بگرێدە.
5. ناڤێ خۆ و پۆل و رۆژێ ل سەر دەستمالا کاغەزێ بنڤێسە و دەستمالێ بکە دبیکەرەکێ پاقژێ 250 mL دا، و بارستێ دەستمالێ و بیکەری بپیڤە و نێزیك بکە بۆ 0.01 g .

## رێکا کاری

1. نێزیکی 15 mL گیراویێ $Na_2CO_3$ بپیڤە ب لولەکەکا پلەدار. ئەڤی قەبارەی بنڤێسە دخشتێ زانیارییاندا یێ نزیك کری بیت بۆ 0.5 mL . گیراویێ $Na_2CO_3$ ڕوییکەرە بیکەرەکێ پاقژێ 250 mL . لوولەکا پلەدار بشۆ و ئاڤا دلۆپاندی تێوەردە.
2. 25 mL یێن گیراویێ $SrCl_2$ 0.30 M بپیڤە ب لوولەکەکا پلەدار. ئەڤی قەبارەی بنڤێسە و نێزیك کری بیت بۆ 0.5 mL د خشتێ زانیارییاندا. گیراویێ $SrCl_2$ دگەل گیراویێ $Na_2CO_3$ ڕوییکە (بکە) دبیکەرەکیدا هەروەك د شێویێ (أ) دا دیار. تێکەلێ باش ب کەڤچکەکێ
3. ب هشیاری و هویری 10 mL ژ گیراویێ $SrCl_2$ ب لوولەکەکاپلەدار بپیڤە، قەبارەی د خشتێ زانیاریاندا بنڤێسە و نێزیك بکە بۆ 0.5 mL . ئەڤێ پێنگاڤێ دوبارەبکە هەتا کو پەیدابوونا نیشتۆی (ڕەملتە)، ڕادوەستیت.

**شێوێ (أ)** نیشتۆ بەرهەمێ دناڤبەرا $Na_2CO_3$ و $SrCl_2$. یە

**شێوێ (ب)** بیکەرەکی ب کێمەکا ئاڤا دلۆپاندی بشۆ. ئاڤێ ل دیوارێن بیکەری بکە داکو نیشتۆ (ڕەملتە) خرڤەبیت و هەمیێ ڤەگوهێزیە کوڤکێ.

4. هەر ب نیشتنا نیشتۆوی، تێکەلی هێدی بکە د کوڤکێ دا، بەلێ ئاگەداریی کوڤك بسەردا نەچیت، چونکە پشکەکا نیشتۆی دێ وندابیت دناڤبەرا شیشەی و کاغەزا پالاوتنێ (پارزنینێ). کەڤچکێ شووشەی بکاربینە بۆ ئینانا خوارێ یا نیشتۆی (ڕەملتەی) بۆ کوڤکێ.

5. کەڤچکی ل سەر بیکەری بشۆ ب کێمەکا ئاڤا دلۆپاندی و ئەوی گیراوێ بکە د کوڤکێ دا، کێمەکا ئاڤا دلۆپاندی بکە بیکەری و بشلقینە پاشی بکە د کوڤکێ دا. ئەڤێ چەند جارا دوبارەبکە هەتا کو بیکەر ب تەمامی ژ نیشتۆی پاقژ دبیت. هەروەك د شێوێ (ب) دا دیارە.

6. پشتی کریارا پالاوتنێ (پارزنینێ) ب دوماهی دهێت، کاغەزا پارزنینێ ب کێمەکا ئاڤا دلۆپاندی بشۆ بۆ پشتڕاستبوون ژ هاتنا خوارێ یا خلتەیێن مایی یێن دشیاندایە هەل ببن د کاغەزێدا.

7. کاغەزا پالاوتنی (پارزنینێ) ب هشیاری ل سەر کوڤکێ ڕاکە و دانە سەر ئەردی دەستمالا کاغەزێ ئەوا ناڤێ ل سەرکری. کاغەزا =پارزنینێ ڤەکە و دەستمالا کاغەزێ دگەل کاغەزا پارزنینێ و نیشتۆی د بکە دبیکەریدا و بکە د فڕنا هشککریدا داکو ئەنجامێن باشتر بدەستڤەبینی ڕەملتی بهێلە بۆ چەند دەمژمێرەکا دا هشك ببیت (بۆ ڕۆژا پاشتر).

8. بیکەرگری بکاربینە، نموونا خوٚ ژ فڕنا هشککرنێ بینەدەر و بهێلە ساربببیت. بارستێ بیکەری ب تشتێن تێدا بپیڤە و نێزیك بکە بۆ $0.01\ g$ و ئەنجامی د خشتێ زانیارییاندا بنڤێسە.

### پاقژکرن و ڕزگاربوون ژ باشەرۆیان (بەرمایکان)

9. ڕەملتەی بکە د ئەردێ سەلکا گلێشیدا ئەوا مامۆستای دەستنیشان کری. ئەوێ هاتییە پارزنین روهن یێ بکە بیکەرەکێ دیێ $250\ mL$ پاشی بۆ وی ئامانێ دیارکری. تاقیگەهێ و هەمی ئامێران پشتی بکارئینانێ پاقژبکە. خوٚ ژ ماددان ڕزگاربکە ل دویڤ ڕێنماییێن مامۆستای دەستێن خوٚ باش بشۆ پشتی ژ کارێ تاقیگەهێ تەمام دبی و بەری ژ تاقیگەهێ دەربکەی.

## شرۆڤەکرن و لێکدانەڤە

**1. ڕێکخستنا هزران**: هاوکێشا هاوسەنگ بۆ کارلێکێ بنڤێسە. نیشتۆ (ڕملتە) چییە؟ شێوگێ سەرەتاییێ وی بنڤێسە:

**2. کارپێکرنا هزران**: بارستیێ نیشتۆییێ (ڕەملّتەی) هشك بینەدەر. هژمارا مۆلێن نیشتۆییێ (ڕملتەی) پەیدابووی ژ کارلێکێ چەندن؟ (تێبینی: ئەنجامێن برگا 8 بکاربینە)

**3. کارپێکرنا هزران**: چەند مۆلّ ژ $Na_2CO_3$ د 15 mL وێ نموونێدا هەنە؟

**4. هەلّسەنگاندنا ڕێکان**: 0.30 mol یێن $SrCl_2$ د لترەکا گیراوەیدا هەنە. هژمارا مۆلێن $SrCl_2$ یێن کرینە سەر بینەدەر. دیاربکە کیژ ژ $SrCl_2$ و $Na_2CO_3$ کارلێککریێ دیاریکەر بوو؟ ئەرێ ئەڤ تاقیکرنە دا یا ب سەرکەفتی بیت ئەگەر کارلێککریەکێ دی وەك کارلێککریێ دیاریکەر بکارئینابا؟ ئەگەرێ وێ دیاربکە.

**5. هەلّسەنگاندنا ڕێکان**: بۆچی نیشتۆ (ڕەملّتە) گەلەك جاران هاتە شووشتن د پێنگاڤا 6 یێ ژ ڕێکا کاری؟ ئەو چ خەلتن هاتینە حەلاندن ئەوێن دبیت ل سەر کاغەزێ هەبن دگەل نیشتۆی؟ ئەوی جوداهیێ دیاربکە ئەوا ل سەر ئەنجامێن هاتینە هژمارتن ئەگەر نیشتۆ ب تەمامی هشك نەکربا، بەرسڤێ شرۆڤەبکە.

ناڤ ............................ بەروار ............................ پۆل ............................

بەندێ 4
ساخلەتێن فیزیایی بۆ گازان

پێداچوونا پشکا 1-4

# بیردۆزا لڤینا گەردی یا مادەی

**بەرسڤا کورت:** بەرسڤا پرسیارێن دهێن لجهێ دیارکری بدە.

1. کیژ ژ ڤان دەربڕینێن دهێن وسفا گازەکا نموونەیی یان گازەکا راستەقینە دکەت؟

أ. ______ تەنولکێن گازێ بهێلێن راست دلڤن، تاکو بتەندلکێن دیتر، یان بدیوارێ ئەو ئامان تێدا بکەڤن.

ب. ______ تەنولکێن کت (تاك) یێن گازا قەبارەکا پیڤای هەیە.

ج. ______ گاز حەست نابیت، ئەگەر سارکرن ژی یان پەستان ژی لسەر بهێتەکرن.

د. ______ پێکدادان دناڤبەرا گەردان بتەمامی یا نەرمە.

ه. ______ تەنولکێن گازێ ئەوێن نێزیك تەنولکێن دیتر دچن،هندەك ژ وان بهێزا راکێشانێ کاردکەنە سەر هندەکێن دیتر.

2. ئەگەر بزانی کو لڤینا وزێ بئەڤێ پەیوەندییا بیرکاری دەربڕین ژێ دهێتەکرن $KE=\frac{1}{2}mv^2$ بەرسڤا ئەڤێن دهێن بدە:

أ. ______ بڕا لڤینا وزێ دێ چ لێ هێت، ئەگەر بارستە سێ جارا هند زێدەببیت (ب جێگریا لەزاتییێ).

ب. ______ لڤینا وزێ دێ بیتە چەند ئەگەر لەزاتی تێکچووبۆ نیڤێ (جێگیریا لەزاتییێ).

ج. ______ ئەگەر دوو گاز، دهەمان پلا گەرمیێدا بن، و هەمان بڕا لڤینا وزێ هەبیت، تو پێشبینی دکەی لەزاتیا گەردێن مەزنتر دچاوا بن؟

________________________________________

________________________________________

3. بیردۆزا لڤینا گەردان بکاربینە ژ بۆ شرۆڤەکرنا هەر ئێك ژ ئەڤان دیاردەیێن دهێن:

أ. ئەگەر گازەکا بهێن تیژ ژ ئامانەکێ نیڤا ژوورێدا دەرپەری، ئەو دێ بلەز هەمی کوژییێت ژوورێ بەلاڤابیت.

________________________________________

ب. دەما ئێك مۆل ژ گازەکا راستەقینە پربکەن دا شل ببیت، قەبارا وی دێ ژ 1000 جاران پتر تێك چیت.

________________________________________

ج. هەکو گازەکێ گەرم دکەن، لەزاتیا دەرپەڕینا وێ دکونەکا بچویکرا دێ زێدەبیت، ئەگەر هەمی هۆکارێن دیتر دجێگیربن.

________________________________________

________________________________________

ناڤ ........................................ بەروار ........................................ پۆل ........................................

**4.** بۆچی گەردێن جەمسەرداریێن گازان لادانەکا رەفتارەکا نموونەیی مەزنتر ژ ئەوا گەردێن بێ جەمسەر دیاردکەن، هەکو هەمی هۆکارێن دیتر دجێگیربن (بارستە ، پلا گەرمییێ...)؟

---

---

**5.** جوداهییێ دناڤبەرا ڤەچەمیایێن دابەشکرنا لەزاتیا گەردێن گازی روونبکە دهەردوو پلێن گەرمییێدا ئەوێن دوێنی خارێدا دیارکرین:

---

---

---

ناڤ ........................ بەراور ........................ پۆل ........................

# بەندێ 4 ساخلەتێن فیزیایی بۆ گازان

پێداچوونا پشکا 4- 2

## پەستان

**بەرسڤا کورت : بەرسڤا پرسیارێن دهێن لجهێ دیارکری بدە:**

**1.** ______ پەستان = هێز / روبەرێ روی. دەما روبەرێ روی سێ جار زێدە دبیت، دێ پەستان:

أ. سێ جار زێدەدبیت.

ب. دێ کێم بیت بو سێیەکێ.

ج. ناهێتە گوهۆرین.

**2.** ______ پەستانێن دهێن بەرسڤ ئەڤە ریزبەکە:

أ. 50 kPa

ب. 2 atm

ج. 76 torr

د. 100 $N/m^2$

**3.** ئەڤ نەخشێ ل خوارێ یێ دیارە:

| پەستانا هەوایی (kPa) | بلنداهی ژ ئاستێ رویێ دەریایێ (km) |
|---|---|
| 100 | 0 (ئاستێ رویێ دەریایێ) |
| 50 | 5.5 (کومتێ چیایێ کلیمانجارۆی) |
| 25 | 11 (بلنداهیا فرۆکێ) |
| < 0.1 | 22 (چینا (تەخا) ئۆزۆن) |

أ. بۆچی پەستان کێم دبیت دەما بلنداهی زێدەدبیت؟

______________________________________________

______________________________________________

ب. هندەك جهـ هەنە لجیهانێ دكەڤنە ژێر ئاستێ رێ دەریایێ (وەك دەریا مری (مەیت) بۆ نموونە). تێکرا پەستانا دروست ل وێرێ چەندە؟

______________________________________________

______________________________________________

ناڤ ........................................ بەروار ........................................ پۆل ........................................

**چەند پرسیارەك:** بەرسڤا پرسیارێن دهێن بدە و رێکا ڤەدیتنێ دڤالاهیا دیارکریدا روونبکە.

**4.** پەستانێ 0.200 atm بگوهۆرە بۆ یەکێن دهێن:

أ. ________ mm Hg

ب. ________ torr

ج. ________ Pa

د. ________ k Pa

**5.** بلنداهیا جیوەی دناڤ بارۆمەتریدا راستەوانە دهێتە گوهۆرین دگەل پەستانا یەر رویێ جیوەی. تێکرایا پەستانێ لئاستێ دەریایێ دبیتە 1.0 atm و ئاستێ جیوەی دبارۆمەتریدا 760 mm ە. دبیت پەستانا کەشی (پەستانا سەقای) دبارۆڤەیەکێدا (إعصار) بگەهیتە کێمتر ژ 710 mm.

أ. ________ خاندنا پەستانی ژ 710 mm بگهۆرە بۆ atm .

ب. ________ خواندنا بارومەتری ب mm Hg چەندە لژێر پەستانا 0.50 atm؟

ج. ئەرێ دشێین بارۆمەتری (پەستان پیف) وەك پیڤەر بۆ بلنداهییێ بکاربینن؟ گرۆڤەیێ تەچی یە؟

________________________________________

________________________________________

ناڤ ............................ بەروار ............................ پۆل ............................

بەندێ 4
ساخلەتێن فیزیایی بۆ گازان

پێداچوونا پشکا 4- 3

# یاسایێن گازی

**بەرسڤا کورت** : ل جهێ دیارکری بەرسڤا پرسیارێن دهێن بدە:

1. روون بکە چاوا دێ بەشە پەستانا گازەکا هشك ئینینەدەر کو ب لادان و جهگرتنا ئاڤێ هاتبیتە کۆمکرن؟

________________________________________

________________________________________

2. تایرا پایسکلەکێ هاتە پڤدان هەتا پەستانا 3.8 atm د پلا گەرمییا 15ºC دا.

أ. ئەگەر تایرە هاتە گەرمکرن و بایێ دناڤدا دپلا 30ºC ژ ئەنجامێ لێکخشیانا وێ (احتكاك) دگەل رێکێ، ئەرێ پەستان دێ بلند بیت یان دێ نزم بیت؟ (وەسا دانە کو قەبارێ تایرێ یا جێگرە)؟

________________________________________

________________________________________

ب. ژبەر کو پلا گەرمیێ یا بۆیە دووجا هند، ئەرێ پەستان ژی دێ دووجارا لێ هێت دا بگەهیتە 7.6 atm ؟

________________________________________

________________________________________

**چەند پرسیارەك** : بەرسڤا پرسیارێن دهێن بدە، رێکا ژمێریا وان دڤلاهیا دەست نیشانکری دیاربکە.

3. ________ نموونا گازەکێ قەبارێ وێ L 24 کارتێکرنا پەستانا وێ 3.0 atm (بارستە و پلا گەرمییێ دجێگیرن). ئەگەر قەبارێ وێ بیتە L 16 کاریگەرییا پەستانا وێ دێ بیتە چەند؟

4. ________ ژ ئێك ژ تاقیگەهان ژ بۆ ڤەکۆلینا یاسایا بۆیڵ سیستەمێ گازا پەستێوراو هاتیە پەستان (شداندی) د پەمپەکێدا دهێتە بکارئینان. و پەستان دهێتە دابینکرن بتێکرنا کێشێن یەکسان بۆ پەمپێ یان دەرئێنانا وێ. ئەڤجا ئەگەر قەبارێ گازا بنچینەیی 50 mL بوو دەما دوو بارستە لسەر پەمپێ هەبن. پێشبینیا قەبارێ نوی یێ گازێ بکە هەکو چار بارستەیێن دیتر لسەر پەمپێ زێدەدکەن.

ناڤ ............ بەروار ............ پۆل ............

**5.** أ. دراوێن (ئەوێن هاتینە دان ییێن) خشتێ دهێت بکاربینە ژ بۆ وێنەکرنا ڤەچەمیاییێ بەشە پەستانا هەلما ئاڤێ، بەرامبەر پلا گەرمیێ لسەر وێنەییێ رۆنکرنێ ئەوێ لخارێ.

| پلا گەرمیێ °C | 0.0 | 5.0 | 10.0 | 15.0 | 20.0 | 25.0 |
|---|---|---|---|---|---|---|
| پەستان (mm Hg) | 4.6 | 6.5 | 9.2 | 13.2 | 17.5 | 23.8 |

............ ب. ئەرێ ئەو خالێ دکەڤنە سەر هێلەکا راست؟

............ ج. پشتا خۆ بڤە چەمیاییێ وێنەکری گرێدە، دا بهاییێ بەشە پەستانا نێزیککری یا ئاڤێ دیارکەی دپلا گەرمیا 11°C دا.

**6.** هەکو مادەکێ وەکو TNT دپەقیت، تێکەلەکێ گازان پەیدادبیت دپلەیەکا گەرمیا بەرزدا (بلند). وەسا دانە کۆ گازا (أ) پەستانا وێ 50 atm ، وگازا (ب) 20 atm و گازا (ج) 10 atm.

............ أ. پەستانا گشتی یا ئەڤێ سیستەمی چەندە؟

............ ب. هەکو تێکەلەکێ گازان دگەل بای تێکەل دبیت، پەستانا گشتی $P_{total}$ بلەز دێ هێتە خار بۆ 2 atm. قەبارێ تێکەلای ب چ کۆلکە زێدەدبیت (وەسادنە کو بارستە و پلا گەرمییێ دجێگرن).

**7.** ............ نموونا گازەکێ قەبارێ وێ 250. mL بوو دپلاگەرمیا 57°C دا. قەبارێ وێ گازە ڤەدگریت دپلا 25°C دا چەندە؟

ناڤ ............ بەروار ............ پۆل ............

بەندێ 4
ساخلەتێن فیزیایی بۆ گازان

# پێداچوونا هەمە جۆر

**بەرسڤا كورت : لجهێ دیاركری بەرسڤا پرسیارێن دهێن بدە.**

1. دبیت دەربرینێ ژ پەستانێ بكەن بئەڤێ هاوكێشێ: پەستان = $\frac{\text{هێز}}{\text{رووبەری}}$

   ______ أ. بزێدەكرنا هێزی و جێگیریا رووبەری دێ پەستان چ لێ هێت؟

   ______ ب. بزێدەكرنا رووبەری و جێگیریا هێزی دێ پەستان چ لێ هێت؟

   ______ ج. بزێدەكرنا رووبەری و نەگوهۆرتنا پەستانێ هێز دێ چ لێ هێت؟

2. بۆچی بالۆنێن ڤەكۆلینێن زانستێ ئەوێن بۆ بلنداهیا بكاردئینن، بەشەك ژێ دهێتە پڤدان بەری بەردانا وان؟

______

______

______

______

3. بیردۆزا لڤینا گەردی بكاربینە، ژبۆ ڕاڤەكرنا بەرزەبوونا (بلند) پەستانێ دناڤ ئامانەكێ گرتیدا دەما گەرمكرنا گازەكێ دناڤدا.

______

______

______

**چەند پرسیارەك : بەرسڤا پرسیارێن دهێن بدە و رێكا ژمێریاریێ دڤالاهیا دەستنیشانكری دا دیاربكە.**

4. ______ نموونەك ژ گازا كلۆری هاتە كۆمكرن ب لادانا (هاتنە خارا) ئاڤێ دپلا گەرمیا 23ºC دا. ئەگەر پەستانا كەشی (سەقای) 751 torr بیت، بەشە پەستانا كلۆری چەندە؟

5. ______ گازا هیلیۆم دبالۆنەكێدا قەبارێ 2.40 L ڤەدگریت دپلا گەرمییا 400 K دا. دێ قەبارێ وێ بیتە چەند دپلا گەرمییا 300 K دا؟

ناڤ .................................................. بەروار .................................................. پۆل ..................................................

6. ______________ أ. دبنێ گەرەکا ئاڤێدا پەقیشەکەکا بای پێك هات قەبارێ وێ 2.0 mL بوو پەستان ژی لوێرێ 3.0 atm بوو. هەر چەند پەقیشکا بای بلندبیت پەستان لسەر کێم دبیت. ئەگەر وەسا دانینن کو پلا گەرمیێ نەگۆڕە، ئەرێ تو پێشینی دکەی قەبارێ پەقیشکێ دێ چ لێ هێت دەما بلند دبیت؟

______________ ب. پێشبینیا قەبارێ پەقیشکێ بکە هەکو دگەهیتە سەر روییێ ئاڤێ کو پەستان لوێرێ 1.0 atm .

7. دخالەکا دیارکری یا زڤرینا (پەمپەی) مکبس دمەکینا ترۆمبێلەکێدا، قەبارێ تێکەلێ سووتەمەنی دناڤ بوتلی دا دبیتە، $400\ cm^3$ لژێر پەستانێ 1.0 atm و دپلا گەرمیا 27°C دا.

______________ أ. هەکو پەستان لسەر پەمپەی دهێتەکرن، پلا گەرمیێ دگەهیتە 77°C و قەبارە تێك دچیت تاکو $50\ cm^3$ پەستانا نوی چەندە؟

______________ ب. پاش گڤاشتنا پەمپەی، چرایێ هەلکرنێ تێکەلێ سووتەمەنی دسوژیت، توپێشبین دکەی پلا گەرمیێ دێ چ لێ هێت؟

______________ ج. تو پێشبینی دکەی قەبارێ گازێ دێ چ لێ هێت؟

8. ______________ لسپێدەیەکا سەرما دزڤستانێدا، و دەما پلا گەرمیێ دگەهیتە 13°C– پەستانا بای دناڤ تایرا ترۆمبێلەکێدا دگەهیتە 1.5 atm ئەگەر وەسا دانێن کو قەبارەیێ جێگرە، ئەگەر تایرە گەرم ببیت تا 13°C پەستان دێ بیتە چەند؟

ناڤ ........................ بەروار ........................ پۆل ........................

بەندێ 5
پێکئینانا گەردی بۆ گازان

پێداچوونا پشکا 5 - 1

# پەیوەندیێن قەبارە – بارستە یا گازان

**بەرسڤا کورت :** لجهێ دەستنیشانکری بەرسڤا ئەڤێن لخارێ بدە:

**1.** ______ قەبارێ گازی راستەوانە هاوریژەیە دگەل هژمارا مۆلێن وی، دەما جێگیریا.

أ. پەستان.

**ب.** پلا گەرمیێ.

**ج.** لەزاتیا گەردان.

**د.** هەر ئێك ژ پەستان و پلا گەرمیێ.

**2.** ______ بارستا مۆلی بۆ گازەکێ د ب.پ ( STP ) دا یەکسانە چریا ئەوێ گازێ.

أ. لێکدایی بارستا مۆلەکی

**ب.** دابەشکری لسەر بارستا ئێك مول

**ج.** لێکدایی بـ $22.4\ L$

**د.** دابەشکری لسەر $22.4\ L$

**3.** دوو ئامانێن دەرگرتی أ و ب یەکسانن د قەبارێدا لدویڤ ئێك $H_2$ ،$Cl_2$ تێدانە، دئێك بارێ پەستان و پلا گەرمیێدا.

______ أ. بەراوردیێ دناڤبەرا هەردوو ئامان دا بکە ژ لایێ هژمارا گەردان.

______ **ب.** بەراوردیێ دناڤبەرا هەردوو ئامانان بکە ژ لایێ بارستێ ڤە.

**ج.** وەسا دانە کو ئامانێ (أ) دهێتە گەرمکرن و قاپێ (ب) دهێتە سارکرن. ئەری دێ پەستان وەکو خۆ مینیت دهەردوو ئامانانداد؟ ئەگەر بەرڤ (نەخێر) بوو، پا دکیژ هەردوو ئامانان دا دێ پەستان بلندتر بیت؟

______

______

______

**چەند پرسیارەك : بەرسڤا پرسیارێن دهێن بدە، رێکا ژمیریاریێ دڤالاهیا تایبەتدا دیاربکە.**

**4.** ______ أ. هژمارا مۆلێن میثان $CH_4$ چەندن دقەبارا $5.6\ L$ ژ گازێ د ب . پ ( STP ) دا؟

______ **ب.** بارستا نموونەکا $CH_4$ چەندە کو قەبارا وێ $5.6\ L$ بیت؟

ناڤ ............ بەروار ............ پۆل ............

.5 ________ چڕیا گازا $CO_2$ د ب ، پ ( STP ) دا چەندە؟

.6 ________ $H_2$ لدویڤ هاوکێشا لخارێ کارلێکی دکەت ئەوا بەرهەمئینانا گازا NH3 دنوێنیت (دیاردکەت):

$$N_2(g) + 3H_2(g) \rightarrow 2NH_3(g)$$

ئەگەر 1 L $H_2$ هاتە مەزاختن، قەبارێ ئەمونیایێ بەرهەمهاتی چەندە دپلا گەرمی و پەستانا جێگردا، پشت گیری بیاسایا گایلۆساك یا قەبارێن ئێککگرتی بکە.

.7 ئەڤ دراوێن (ئەوێت هاتینە دان) دخشتێ خارێدا بکاربینە، ژ بۆ بەرسڤدانا پرسیارێن پشتی وان:

| شێوك | بارستا مۆلی ( g/mol ) |
| --- | --- |
| $N_2$ | 28.02 |
| CO | 28.01 |
| $C_2H_2$ | 26.04 |
| He | 4.00 |
| Ar | 39.95 |

(وەسا دانە کو هەمی گاز د ب ، پ STP ) دانە.

________ أ. گازا کێمترین چڕی کیژە؟

________ ب. کیژ هەردوو گازن نیزیکە هەمان چڕی هەبن؟

________ ج. چڕیا پیڤای یا هەردو گازێن د (ب) دا د ( STP ) دا چەندە؟

ناڤ .................................................. بەراور .......................................................... پۆل ..................................................

بەندێ 5
پێکئینانا گەردی یا گازان

پێداچوونا پشکا 5 - 2

# یاسا گازا نموونەیی

**بەرسڤا کورت : لجهێ دەستنیشانکری بەرسڤا پرسیارێن دهێن بدە:**

1. ________ کیژ ئەڤێن لخاریێ دبیتە ئەگەرێ زێدەبوونا قەبارەی، ئەگەر بزانی $V = \frac{nRT}{P}$ ؟

أ. زێدەبوونا $P$ ج. بەرزبوونا $T$

ب. نزمبوونا $T$ د. کێمبوونا $n$

2. دبیت هاوکێشا $PV = nRT$ جارەکا دیتر رێك بێخین ژبۆ ڤەدیتنا ژ گۆرانکارییێن وێ. چاوا دێ هاوکێشێ رێکێخین ژ بۆ ڤەدیتنا هەر ئێك ژ:

________ أ. P

________ ب. T

3. چاوا دشێین یاسایا گازا نموونەیی کورت بکەی؟ ئەڤێ چەندێ شرۆڤە بکە ژ بۆ دەستڤەئینانا یاسا ئەڤۆگادرۆ کو دەربرین ژێ دهێتە کرن بـ $k = \frac{v}{n}$ ، ئەگەر پەستان و پلا گەرمییێ دجێگربن.

________________________________________________

________________________________________________

________________________________________________

**چەند پرسیارەك : بەرسڤا پرسیارێن دهێن بدە، رێکا ژمێریاییێ دڤالاهیا تایبەتدا دیاربکە:**

4. ________ أ. قەبارێ بوتلەکێ گازا He ئەوا بۆ پرکرنا بالۆنا دهێتە بکارئینان ( 25.0 L ) ، دپلا گەرمیا 22ºC و لژێر پەستانێ 5.6 atm . هژمارا مۆلێن He بوتلیدا چەندن؟

________ ب. بارستێ نموونەیا هیلیۆم ئەوا دپرسیارا (أ) دا چەندە؟

5. ________ أ. چرپیا گازا X یەکسانە بـ 2.60 g/L د ب،پ ( STP )دا. بارستا مۆلی یا ئەوێ گازی بدۆزە (بینەدەر).

ناڤ ............ بەروار ............ پۆل ............

ب. گازا Y هەمان چڕیا X یا هەی،2.60g/L. بەلێ دپلا گەرمیا 77ºC دا و لژێر پەستانێ 0.80 atm دا. مەرج نینە بارستا مۆلیا گازا Y وێ یەکسانی بارستا مۆلی یا گازا X بیت، هەر چەندە هەردوو گازان ئێك و چڕی هەبیت. شرۆڤەبکە بۆچی چڕیا هەردو گازێن X و Y وەك هەڤن، دگەل هندێ کو بارستێ مۆلی یا وان ژێك جودانە؟

______

______

______

______ ج. بارستا مۆلی یا گازا Y بینەدەر.

6. ______ أ. هژمارا مۆلێن گازا میثان $CH_4$ ، ئەوێن دنموونەیەکا بارستە 4.0 g یدا هەین چەندە؟

______ ب. ئەو پەستان بتۆری ( torr ) کۆ نموونەیەکا گازا $CH_4$ پەیدادکەت بینەدەر ئەگەر پلا گەرمیا وی 27ºC و قەبارێ وێ 3000. mL بیت.

7. ______ نموونەیەکا گازا ئەرگۆن قەبارێ وێ 7.00 L بوو دپلا گەرمیا 420. K دا و پەستانەکی پەیدا دکەت کو 625 k Pa بوو. ئەگەر پەستان لسەر گازێ هاتە کرن تا قەبارێ 1.25 L و پلا گەرمییێ نزمبوونا کو 350. K ئەرێ پەستانا نوی دێ چەند بیت؟

ناڤ ............ بەروار ............ پۆل ............

بەندێ 5
پێكئینانا گەردی یا گازان

پێداچوونا پشکا 5 - 3

# ژمێریارییێن کیمیایی بۆ گازان

**بەرسڤا کورت** : **لجهێ دیارکری بەرسڤا پرسیارێن دهێن بدە:**

**1.** ______ دبیت دەربڕین ژ قەبارەین کارلێککری د بەرهەمهاتێن گازی دکارلێکا کیمیاییدا بهێتەکرن بریژەیێن هژمارەیی یێن سادە ئەگەر.

أ. کارلێککری و بەرهەمهاتی هەمی گازبن.

ب. پلا گەرمیێ و پەستانێ پێوانەیی دجێگربن.

ج. پلا گەرمیێ و پەستان بمیننەڤە دجێگیر.

د. هەمی بارستە ب بڕا 1 mol بن.

**2.** ______ د کارلێکا $2H_2(g) + O_2(g) \rightarrow 2H_2O(g)$ دا، رێژەیا قەبارێ $H_2$ بۆ قەبارێ $H_2O$ دبیتە:

أ. 1:1 ج. 4:3

ب. 2:1 د. 4:6

**3.** ئیثانۆل، ئێك ژ پێکهاتێێن سووتەمەنیێ کهولییە. ئەو هاوکێشا سووتنا بتەمامی یا وێ دنوێنیت (دیاردکەت) ئەڤا لخارێیە:

$$C_2H_6O(g) + xO_2(g) \rightarrow 2CO_2(g) + 3H_2O(l)$$

أ. ______ بهایێ x چەندە دەما هاوکێشە بشێوەکی دروست یا هاوسەنگ هاتبیتەکرن.

ب. ______ کیژ مەزنترە: قەبارێ $O_2$ یا کارکری یان قەبارێ $CO_2$ یا بەرهەمهاتي؟ وەسا دانە کو کارلێککری و بەرهەمهاتي هەمي لژێر هەمان باردانە)

**4.** ئەڤ کارلێکا دهێت دئامانەکێ نەرم دا روێ ددەت:

$$H_2(g) + I_2(g) \rightarrow 2HI(g)$$

دەمێ دئەڤێ کارلێکێدا، پلا گەرمیێ و پەستان جێگیر دمینیت. پێشبینی دکەی قەبارە چ لێ بێت، دەما کارلێك روی بدەت؟ بەرسڤێ شرۆڤەبکە.

______________________________

______________________________

______________________________

______________________________

ناڤ .................................... بەروار .................................... پۆل ....................................

**کورتە بەرسڤ : بەرسڤا پرسیارێن دهێن بدە، و کارێ خۆ دڤالاهیێن تایبەتدا دیاربکە.**

**5.** هەکو $C_3H_4$ د ب ، پ ( STP ) دا دهێتە سووتن، 5.6 L ژ $C_3H_4$ ژ کاردکەڤیت لدویڤ هاوکێشا دهێت.

$$C_3H_4(g) + 4O_2(g) \rightarrow 3CO_2(g) + 2H_2O(l)$$

______ أ. هژمارا مۆلێن $C_3H_4$ یێن کارلێککری چەندن؟

______ ب. هژمارا مۆلێن $O_2$ یێن ژ کارکەفتی چەندن؟ و هژمارا مۆلێن $CO_2$ و $H_2O$ یێن بەرهەمهاتی چەندن؟

______

______

______ ج. چەند گرام یێن $C_3H_4$ ژ کارکەفتینە؟

______ د. چەند لێتر یێن $CO_2$ پەیدابوونە؟

______ ه. چەند گرامێن $H_2O$ پەیدابوونە؟

**6.** ______ کلۆر دشێت لچینێن کەشی (سەقای) یێن بلند گەردێن ئۆزۆنێ $O_3$ لێك هەلبوەشینیت. و دشێین کارلێکێ ب ئەڤێ هاوکێشێ دیاربکەین:

$$Cl_2(g) + 2O_3(g) \rightarrow 2ClO(g) + 2O_2(g)$$

چەند لێترێن ئۆزۆنی دبیت لێك بهەلوەشن دپلا 220. K و 5.0 k Pa دا ئەگەر 200.0 g ژ گازا کلۆری کارلێکێ دگەل ئۆزۆنێ بکەن؟

ناڤ .............................................. بەروار .............................................. پۆل ..............................................

**بەندێ 5**
**پێکئینانا گەردی بۆ گازان**

پێداچوونا پشکا 5 - 4

# دەرپەڕین و بلاڤبوون

**بەرسڤا کورت: لجهێ دەستنیشانکری بەرسڤا پرسیارێن دهێن بدە:**

**1.** ______________ ئەڤ گازێن دهێن بەرەڤ ژووری لدویڤ لەزاتیا دەرپەرینا وان ریزبکە (وەسا دانە کو هەمی گاز دهەمان بارێ پەستان و پلا گەرمێدانە).

أ. He　　ب. Xe　　ج. HCl　　د. $Cl_2$

**2.** ______________ دوو گاز دهەمان دەمدا ژ هەردو سەرێن بۆرییێ دهێنە ژوور، دشێوێ دهێت. ل نك كیژ خالێ تو پێشبینی دکەی کو هەردو گاز تێکەل ببن؟

**3.** ______________ دهاوکێشا گراهامدا دشێن رەگێ دوجا ______________ ب رەگێ دووجاییێ بارستا مۆلی بهێتە گوهۆرین.

أ. چریا گازێ　　ج. پەستانێ (گڤاشتن)

ب. قەبارێ مۆلی　　د. جێگرێ گازان

**4.** ______________ دبیت دەربرینێ ژ رێژا بارستەیا مۆلی یا دو گازێن ( A ، B ) بکەن، دهەمان بارێ پەستان و پلا گەرمێدا ب هێما r. رێژا تێکرا لەزاتیا گەردێن A بۆ تێکرا لەزاتیا گەردێن B چەندە؟

أ. $r$　　د. $\frac{1}{r}$

ب. $r^2$　　هـ. $\left(\frac{1}{r}\right)^2$

ج. $\sqrt{r}$　　و. $\sqrt{\frac{1}{r}}$

ناڤ .......................... بەروار .......................... پۆل ..........................

5. پاسەوەکی (هێجەت) بۆ رێزکرنا ئەوان گازێن تە هەلبژارتین دپرسیارا (1) دا بینە. و مفای ژ بیردۆزا لڤینا گەردی بینە ژ بۆ پشتەڤانیا شرۆڤەکرنا خۆ.

______________________________________________

______________________________________________

______________________________________________

______________________________________________

**چەند پرسیارەك: بەرسڤا پرسیارێن دهێن بدە، و کارێ خۆ دڤالاهیا تایبەتدا دیاربکە.**

6. ________ تێبینی هاتەکرن کو گازەکا مۆلە بارستا نەدیار، دکۆنەکا بچویکرا دەرپەڕیت، بچارێکا دەرپەرینا هایدرۆجین. بارستا مۆلی یا ئەوێ گازێ چەندە؟

7. ________ أ. بارستەیێن مۆلی یێن He و HCL لدویڤ ئێك 4.0g/mol و 36.46g/mol رێژا بارستەیا He بۆ بارستەیا HCL چەندە، نێزیك کربیت بۆ ئێك خانا دەهێکی؟

________ ب. بەرسڤا لقا (أ) بکاربینە ژبۆ ڤەدیتنا رێژا دناڤبەرا تێکرا لەزاتیا واندا.

________ ج. ئەگەر تێکرا لەزاتیا هیلیۆم 1200 m/s، تێکرا لەزاتیا HCL چەندە؟

8. ________ گازەکا نەدیار دکۆنەکێرا بلەزاتیا 3.16 جاران کێمتر ژ گازا نیۆن دەردپەریت. بارستا مۆلی بۆ ئەوێ گازا نەدیار بدۆزە (دیاربکە).

ناڤ ............................ بەروار ............................ پۆل ............................

بەندێ 5
پێکئینانا گەردی بۆ گازان

# پێداچوونەکا هەمە جۆر

**بەرسڤا کورت : لجهێ دەستنیشانکری بەرسڤا پرسیارێن دهێن بدە:**

1. ______ تێکرایا لەزایا گەردەکا گازێ راستەوانە هاوڕێژەیە دگەل.

أ. جەمسەردارێا گەردی
ب. پەستانا گازێ
ج. پلا گەرمیا گازێ
د. هژمارا مۆلان د نموونێدا.

2. ______ کیژ ژ دەستەواژێن دهێن بشێوەیەکێ باشترە دەربرینێ ژ یاسایا گراهام بۆ دوو گازان دکەت د هەمان پلا گەرمێدا؟

أ. بارستەیێن مۆلی پێچەوانە (بەروڤاژی) هاورێژە دبن دگەل لەزاتیا وان.
ب. بارستەیێن مۆلی راستەوانە دهێتە گوهۆڕین دگەل لەزاتیا وان.
ج. بارستەیێن مۆلی پێچەوانە هاوریژ دبن دگەل رەگێن دووجاییێن لەزاتیا وان.
د. رەگێن دووجاییێن بارستەیێن مۆلی پێچەوانە هاورێژەنە دگەل لەزاتیا وان.

3. ئاڤ لدویڤ هاوکێشا ل خوارێ ژ توخمێن خۆ پێك دهێت.

$$2H_2(g) + O_2(g) \rightarrow 2H_2O(l)$$

______ أ. کیژ وان مەزنترە: قەبارەیێ $H_2$ یا کارکری، یان قەبارەیێ $O_2$ ؟

______ ب. کیژ وان مەزنترە: بارستەیێ $H_2$ یا کارکری، یان بارستەیێ $O_2$ یا کارکری؟

4. تە نموونەك ژ گازا نموونەیی هەیە قەبارێ وی 2.24 L ە د ب، پ ( STP )دا.

______ أ. چەند مۆل دنموونێدا هەنە؟

______ ب. هژمارا گەردان دنموونێدا چەندن؟

**چەند پرسیارەك : بەرسڤا پرسیارێن دهێن بدە، و کارێ خۆ دڤالاهیا تایبەتدا دیاربکە.**

5. ______ قەبارێ 3.5 mol یێن گازەکا نموونەیی بدۆزە (بینەدەر) دپلا گەرمیا 24ºC و پەستانا 760 torr دا

6. ______ بارستا مۆلی یا گازەکێ چەندە کۆ چڕیا وێ 2.68 g/L بێت د ب. پ ( STP ) دا؟

ناڤ ........ بەروار ........ پۆل ........

**7.** نموونەیەك ژ گازا ئۆكسجین بارستەیێ وێ 8.00 ، و پلا كەلینا وێ $-183^{\circ}C$ .

________ أ.  پلا كەلینا وێ ب كەلڤن چەندە؟

________ ب.  شێوگێ ئۆكسجین و مۆلە بارستەیا وی چەندە؟

________ ج.  هژمارا مۆلێن ئۆكسجین دئەڤێ نموونەییدا چەندن؟

________ د.  ئەو پەستانا ئەڤ نموونەیە پەیدادكەت چەندە، ئەگەر كرە دشیشەكێ قەبارە 8.21 L دا پلا گەرمیا $77^{\circ}C$ دا؟

**8.** گازا هایدرۆجین لتاقیگەهێ ژ كارلێكا ترشێ هایدرۆكلۆریك دگەل ئەلەمنیوم ئامادەدكەن. لدویڤ هاوكێشەیا دهێت:

$$2Al(s) + 6HCl(aq) \rightarrow 2AlCl_3(aq) + 3H_2(g)$$

________ أ.  قەبارێ $H_2$ یا پێكهاتی دپلا گەرمیا $20.0^{\circ}C$ و پەستانێ 750. torr دا چەندە هەكو 9.00 g ژ ئەلەمنیۆم كارلێكێ دكەت لدویڤ هاوكێشەیا سەری؟

________ ب.  گازا هایدرۆجین پلا دانا ئاڤێ دهێتە كۆمكرن. جارەكا دیتر قەبارێ گازا هشك بدۆزە (بینەدەر)، تە ئاگەه لبەشە پەستانا هەلما ئاڤێ هەبیت، دپلا گەرمیا كارلێكێدا.

ناڤ ........................ بەروار ........................ پۆل ........................

بەندێ 6
شل و ماددێن رەق

پێداچوونا پشکا 6 - 1

## شل

**بەرسڤا کورت** : لجهێ دەستنیشانکری بەرسڤا پرسیارێن دهێن بدە:

1. ــــــــ هێزێن هەڤکێشانی یێن دهێن بەرەڤ ژوور لدویڤ هێزا وان رێزبکە.
   - أ. بەندا هایدرۆجین
   - ب. هێزێن پرتبوونا لۆندۆن
   - ج. بەندا ئایۆنی
   - د. هێزێن دووجەمسەر – دوو جەمسەر

2. ــــــــ ئەو دەستەواژەیێن دهێن لدور شل و گازان هەمی دروستن ژبلی:
   - أ. گەردێن شلا نێزیکترە بۆ ئێك دوو ژ گەردێن گازا.
   - ب. دبیتن گەرد بلەرزن یان بزڤرن، بەلێ ئەو نەشێن بئازادی بلڤن، وەکو دگازا دا رویددەت.
   - ج. گڤاشتنا شلان دقەبارەکێ بچیکتردا گەلەك بزەحمەت ترە ژ یا گازان.
   - د. بلاڤبووبا شلان هێدیترە ژ یا گازان.

3. ــــــــ شلان هەمی ساخلەتێن دهێن هەنە ژبلی:
   - أ. چڕیا کێمە چاڤ خۆ.
   - ب. شیانا بلاڤبوونێ.
   - ج. نەگڤاشتنا رێژەیی.
   - د. شیانا گوهۆڕێن بۆ گازان.

4. هەر ئێك ژ ئەڤێن دهێن لدیف بیردۆزا لڤینا گەردی روونبکە.
   - أ. شل شێوێ ئەوی ئامانی وەردگریت ئەوێ تێدا، بەلێ ئەوژێك ناهیتە دەر تا کو هەمی قەبارێ ئامانی برپبکەت.

______________________________________________

______________________________________________

______________________________________________

______________________________________________

ناڤ .................................... بەروار .................................... پۆل ....................................

ب. شلێن جەمسەردار ژ شلێن بێ جەمسەر هێدی تر دبنە هەلم.

______________________________

______________________________

______________________________

______________________________

ج. پتریا ماددا دبارۆدۆخێ شلیدا چڕترن ژ وێ ئەگەر دبارەدۆخێ گازێ دابن.

______________________________

______________________________

______________________________

______________________________

**5.** بۆچی شل بەرەف پێکئینانا چپکێن خرڤەدچن؟

______________________________

______________________________

______________________________

______________________________

**6.** ئەرێ بەستن گوهۆرینەکا کیمیایی یان یا فیزیاییە؟ بەرسڤا خۆ روون بکە.

______________________________

______________________________

______________________________

______________________________

ناڤ ........................................ بەروار ........................................ پۆل ........................................

بەندێ 6
شل و ماددێن رەق

پێداچوونا پشکا 6 - 2

# ماددێن رەق

**بەرسڤا کورت: لجهێ دەستنیشانکری بەرسڤا پرسیارێن دهێن بدە:**

**1.** جۆرێ بلورێ لایێ راستێ و سیفەتێن وی لچەپێ بگەهینە ئێك.

______ بلوورا ئایۆنی — أ. ئەلیکترۆنێن لڤوك هەنە دناڤ بلوورێدا.

______ بلوورا هاوبەشی یا گەردی — ب. رەقە، پێتی یە، نەگەهێنە.

______ بلوورا کانزایی — ج. پلا کەلینا وان نزمترە ژ ناڤبەرا هەر چار نموونەیێن بلوورا دا.

______ بلوورا هاوبەشی یا تۆڕی — د. بەندێن هاوبەشێ بهێز هەنە دناڤبەرا گەردیلێن تەنیشت ئێکدا.

هـ. تەنۆلکە تێدا بشێوەکێ نەروکوپێك درێژکرینە.

**2.** بۆ هەر ئێك ژ چار نموونەیێن دهێن بۆ تەنێن رەق نموونەکا جودا ژ نموونەیێن دخشتێ 6-1 ،ل 182 ژ پەرتووکا قوتابی بینە.

أ. تەنێن رەق یێن ئایۆنی. ______

ب. تەنێن رەق یێن هاوبەشێن تۆڕی. ______

ج. تەنێن رەق یێن هاوبەشێن گەردی. ______

د. تەنێن رەق یێن کانزایی. ______

**3.** پارچەکا رصاصێ (قورقشمێ) رەق، هاڤێتە دبرکەکا تژی رصاصێ (قورقشمێ) حەلیای. پارچەنقووم بوو دبنێ برکێدا. دێ بو تە چ دیاردبیت لدور چڕیار رصاصێ (قورقشمێ) رەق بەراوردگەل رصاصێ (قورقشمێ) حەلیای؟

______

______

**4.** بارێ مادەی (شل یان رەق) دیاربکە ئەوا دگەل ساخلەتێن دهێن دگونجن:

______ أ. یێ پتر بەرگریا گڤاشتنی بکەت.

______ ب. یێ پتر بەربەلاڤ دناڤ ناوەندێن دەوروبەرا.

______ ج. قەبارە و شێوە د دەستنیشانکرینە.

______ د. گەردێن وی دزڤرن یان دجهێ خودا دلەرزن.

ناڤ ............ بەروار ............ پۆل ............

5. هەر ئێك ژ ئەڤێن دهێن شروڤەبکە.

أ. کانزاییێن رەق کارەبێ باش دگەهینن، بەروڤاژی پتریا تەنێن رەق یێن تۆڕی.

ب. تێزیکە هەمی تەنێن رەق چرپیا وان پترە ژ وێ ئەگەر دبارێ شلدا بان.

ج. تەنێن رەق یێن نەدبلۆری، خالەکا حەلیانێ یا دیارکری نینە.

6. بۆ حەلاندنا 1 mol ژ بەفرێ، دپلا حەلیانێدا، تاقیکرن دیاردکەن کو پێدڤی 6.0 kJ یێن وزا گەرمێنە. بەلێ بۆ حەلیانا 1 mol ژ میثان $CH_4$ دپلا حەلیانا وێدا بتنێ پێدڤی 0.6 J ین وزێ هەیە. بۆچی پێدڤی وزەکا زۆر کێمترە بۆ حەلاندنا میثانێ؟

ناڤ .................................... بەروار .................................... پۆل ....................................

**بەندێ 6**
**شل و ماددێن رەق**

**پێداچوونا پشکا 6 - 3**

# گوهۆڕینا دۆخی (سەروبەری)

**بەرسڤا کورت: لجهێ دیارکری بەرسڤا پرسیارێن دهێن بدە.**

**1.** تە سیستەمێ هاوسەنگێ لخارێ هەیە:

$$P \text{ (بەرهەمهاتی)} \leftrightarrows R \text{ (کارلێککردوو)}$$

گوهۆڕین لسەر هۆکارێن کارێگەر لسەر هاوسەنگییێ ئارەزوویا رویدانا کارلێکی پێچەوانە لێکر.

أ. خەستیا کارلیککردویا دێ چ لێ هێت؟

______________________________

ب. خەستیا بەرهەمهاتیا دێ چ لێ هێت؟

______________________________

**2.** مۆلە گەرمیا هەلماندنا میثان $CH_4$ $8.19\ kJ/mol$ ـە و بۆ هەلماندنا ئاڤێ $40.79\ kJ/mol$ ـە.

________ أ. ئەگەر $2.0 \times 10^{23}$ گەرد ژ شلێ $CH_4$ بۆ هەلم، چەند گەرمی پێدڤییە بۆ ئەوێ چەندێ؟ هەمی کارێ خۆ روون بکە.

________ ب. پالپشتی لسەر مۆلەگەرمیا هەلماندنا، کیژ وان پتر دفریت $CH_4$ یان $H_2O$؟

________ ج. کیژ گەرد پتر جەمسەردارە $CH_4$ یان $H_2O$؟

**3.** کارلێکا گشتی دەما هاوسەنگیێ و دبارێ کەلینێدا وەك لخارێ دهێتە نڤیسین.

$$\text{گاز } (G) \leftrightarrows \text{وزا گەرمیێ} + \text{(شل) } L$$

دهەر ئێك ژبارێن دهێندا، کیژ وان پەسەندترە: رویدانا کارلێکا پێشینە (راستەوانە) یان کارلێکا پاشینە (پێچەوانە)؟

________ أ. پلا گەرمیا سیستەمی زێدەببیت.

________ ب. گەردێن هەلمێ بکەنە سەر سیستەمی.

________ ج. پەستانا سیستەمی زێدە ببیت.

**4.** تە ئاڤ یا هەی دئامانەکێ ڤەکریدا لسەر ئاگری دکەڤیت.

أ. ئەرێ ئەستەمە دێ گەهیتە هاوسەنگییێ؟ بۆچی؟

______________________________

______________________________

ناڤ .................... بەروار .................... پۆل ....................

**ب.** بەراوردیێ دناڤبەرا سیستەمێ گرتی و سیستەمێ ڤەکریدا شروڤەبکە.

___

___

___

**5.** پلا کەلینا میثانۆلێ $65^oC$ . و میثانۆل دپلا گەرمیا $25^oC$ و لژێر پەستانی $1\ atm$ دا یێ شلە. شیشەکی بچیك تژی میثانۆل کر، و دانا ژێر زەنگلەکا شیشەی، پاشی زەنگل ڤالاکر ژ هەوای. تێبینی کر کو میثانۆل دڤالاهییێدا دپا گەرمیا $25^oC$ دا دێ کەلیت.

نزمبوونا پلا کۆلانا نیثانۆلێ روونبکە، پالپشت لسەر بیردۆزا لڤینا گەردی، و تێگەهێ هەنە پەستان.

___

___

___

___

___

ناڤ .................................... بەروار .................................... پۆل ....................................

## بەندێ 6
## شل و ماددێن رەق

پێداچوونا پشکا 6 - 4

## ئـــاڤ

**بەرسڤا کورت:** **لجهێ دیارکری بەرسڤا پرسیارێن دهێن بدە.**

**1.** پالپشتی لسەر وێنی روونکرییێ خارێ بکە ژبۆ بەرسڤدانا پرسیارێن دهێن:

______ أ. پلا کەلینا $CCl_4$ ێ ئاسایی چەندە؟

______ ب. پلا کەلینا ئاڤێ دێ بیتە چەند، ئەگەر پەستانا هەوای لسەر ئاڤێ نزم ببیت تا بگەهیتە 60 kPa ؟

______ ج. دڤێت پەستانا هەوای لسەر $CCl_4$ چەند بیت تا کو دپلا گەرمیا 50ºC دا بکەلیت.

**د.** زێدەباری ئەوی چەندێ کو مۆلە بارستا ئاڤێ کێمترە مۆلە بارستا $CCl_4$ ، هەڵمە پەستانا وی ژ هەڵمە پەستانا $CCl_4$ کێمترە دهەر وی پلا گەرمێدا. ئەو چی یە وەلتەدکەت پێشبینی بکەی کو هەڵما ئاڤێ کێمتر دفریت ژ $CCl_4$ ؟

______________________________

______________________________

______________________________

______________________________

______________________________

هەڵمە پەستان بەرانبەر پلا گەرمیا $H_2O$ و $CCl_4$

پلا گەرمی ( C° )

ناڤ .................................................. بەروار .................................. پۆل ....................................

2. وەسفا بەندا هایدرۆجینی ئەوا دناڤبەرا گەردێن ئاڤێدا هەی بکە (گەردیلا هایدرۆجینا گەردەکا ئاڤێ و گەردیلا ئۆکسجینا گەردەکا دیتر یا ئاڤێ). و ئەڤێن دهێن روونبکە: جهێ بەندی، تەنولکەیێن پشکدار، هێزا بەندی، کارتێکرنا وێ لسەر ساخلەتێن فیزیایی و کیمیایی ئاڤێ.

**چەند پرسیارەك:  بەرسڤێ لسەر هێلا لایێ راستێ بنڤیسە و کارێ خو دڤالاهیا تایبەتدا دیاربکە.**

3. شەشپاڵوویەکێ بەفرێ قەبارا وێ $16\ cm^3$ . (دراوێن.بمفا: چڕیا بەستییێ ل $0^\circ C$ دا $= 0.917\ g/mL$ گەرمیا حەلیانا بەفرێ $= 6.009\ kJ/mol$ گەرمیا هەلماندنا $H_2O = 40.79\ kJ/mol$ بارستا مۆلی بۆ $H_2O = 18.02\ g/mol$)

______________ أ.  بارستا شەشپالوویا بەفرێ دیاربکە.

______________ ب.  هژمارا مۆلێن $H_2O$ دنموونێدا بژمێرە.

______________ ج.  گەرمیا پێدڤی بۆ حەلیانا شەشپاڵوویەکێ بەفرێ چەندە ب کیلۆجوڵ؟

ناڤ ............................................ بەروار ................................ پۆل ..................................

## بەندێ 6
## شل و ماددێن ڕەق

# پێداچوونا هەمە جۆر

**بەرسڤا کورت: لجهێ دیارکری بەرسڤا پرسیارێن دهێن بدە.**

1. ئەڤ هاوکێشا هاوسەنگ یا گشتی بکاربینە بۆ بەرسڤدانا پرسیارێن دهێن:

وزا گەرمیێ + P (بەرهەمهاتی) ⇆ R (کارلێککردوو)

______ أ. ئەگەر کارلێك بەرەف چەپێ بچیت، ئەرێ خەستیا کارلیککردوویا دێ زێدەبیت یان دێ کێم بیت. یان دێ مینتەڤە جێگر؟

______ ب. ئەگەر بەرهەمهاتیەك زێدەکر، دێ کارلێك بەرەف کیژ لای چیت؟

______ ج. ئەگەر پلا گەرمیا سیستەمی کێمبوو، دێ کارلێك بەرەف کیژ لای چیت؟

2. بەراوردیێ دناڤبەرا گەردەکا ئاڤێ یا جەمسەردار و گەردەکا فورمالدیهایدێ $CH_2O$ یا جەمسەرداریا کێمتر دا بکە، ئەگەر بزانی هەردوو گەرد دشلن (ڕۆن)، دپلا گەرمیا ژورێدا و لژێر پەستانێ 1 atm دا.

______ أ. کیژ شلی پلا کەلینا وێ بەرزترە؟

______ ب. کیژ شل پتر دفریت؟

______ ج. کیژ شل گرژیارییێ وی مەزنترە؟

______ د. کیژ شل زیتر بلاڤ دبیت؟

______ ه. د کیژ شلیدا NaCl دحەلیێت؟

**چەند پرسیارەك: بەرسڤێ لسەر هێلا لایێ راستێ بنڤیسە. و کارێ خۆ دڤالاهیا دەستنیشانکریدا دیاربکە.**

3. ئەگەر بزانی کو گەرمیا مۆلی بو حەلاندنا بەفرێ 6.009 kJ/mol ـە.

______ أ. گەرما پێدڤی بۆ حەلاندنا 1.0 g ژ بەفرێ چەندە؟

______ ب. یەکا وزێ ئەوا پتریا جاران دهێتە بکارئینان کالۆری ( Caloria )ە( 1 کالۆری = 4.18 J) گەرمیا حەلاندنا بەفرێ بکالۆری بۆ هەر ئێك گرام دیاربکە.

ناڤ .................................... بەروار .................................... پۆل ....................................

**4**. ________ فریۆن 11، $CCl_3F$ لپتریا جاران دئیرکۆندێشنادا دهێته بکارئینان مۆله گەرمیا هەلماندنا وێ 24.8 kJ/mol و پلا کەلینا وێ $24^{o}C$ . برا ئەوێ گەرمێ چەندە ئەوا ژ ژوورێ دهێته بەرزەکرن، بئیرکۆندێشنەکێ کو 1.00 kg ژ فریۆن –11 بکەته هەلم؟

# تاقیکرن 1 یاسا بۆیلۆ

## نیشانێن بجهئینانێ

• قەبارا ئەوێ گازا د ناڤ ئامانیدا لژێر پەستانێن جودا دیاردکەت.
• شێوەیێن رۆنکرنێ بۆ پەیوەندیا پەستانێ دگەل قەبارێ وێنە دکەت.
• شێوەیێن رۆنکرنی شلۆڤەدکەت بۆ دەرێخستنا یاسا بۆیلۆ.

## پێشەکی

زانا بۆیل رابۆبڤەکۆلینا پەیوەندییێ دناڤبەرا برەکا دیارکری یا گازێ و پەستانا گازێ دا. د ئەڤێ تاقیکرنێدا دێ پەستانا هەوای ئەوا دورپێچکری دناڤ سرنجەکێدا گوهۆری، پاشی ئەو گوهۆرینا دقەبارێدا ئەنجام ددەت دێ پیڤی. چونکی محالە بشێیی هەما بتنێ ب بەرە خودانێ بۆ پێزانین تومارکری دخشتەیدا پەیوەندییێ دیاربکەی، پێدڤییە شێوێ رۆنکرنێ بۆ ئەنجامێن خو وێنەبکەی، ژبۆ دیارکرنا پەیوەندییێ دناڤ بەرا گۆراواندا، ئەڤ تاقیکرنە پێدڤی ب وێنەکرنا دوو شێوەیێن رۆنکرنێنە، ئێك ژ وان قەبارێ گرێدەت بپەستانێڤە، و ئەوێ دیتر ژ سەرنشیڤکرییێ (مقلوب) قەبارێ بپەستانێڤە گرێددەت. و ژ ئەڤان هەردوو شێوەیان دێ شێی پەیوەندیا بیرکاری دناڤبەرا پەستان و قەبارێدا بینییە دەر. و بجهئینانا یاسا بۆیلۆ

## سەلامەتی

**هەر گاڤ بەرچاڤکا پاراستنێ بدەسەرچاڤێت خۆ و مەلیتکێ تاقیگەهێ بکە بەرخرەبەر بۆ پاراستنا جل و بەرگێن خۆ.**

## مادە و کەرەستە

• دەزگایێ بجهئینانا یاسا بۆیلۆ، یان هەر دەزگایەکێ ل جهێ وێ.
• بەندکەکێ پەمبێ یێ ستیر.
• سەنگێن هەڤ بارستە (بارستە هەر ئێك ژ وان 500g ) 4 دانە.

## رێکا کارکرنێ

**1.** سەرێ پەمپا دەزگایێ بجهئینانا یاسا بۆیلۆ عەیاربکە تا کو دناڤبەرا 30 و 35 سەنتیمەترێت سێجا بمینیت. و کردارا عەیارکرنێ دێ هێتە کرن بکێشانا سەرێ پەمپێ تاکو بتەمامی ژ لەشی سرنجێ بهێتە جوداکرن. سەرەکێ بەندکێ پەمبی بکە دبوریا سرنجێ دا، پاشی بەری سەرێ پەمپێ بدە ئەوی جهێ پێدڤی، هەروەك دشێوێ (أ) دا دیارکری.

**تێبینی:** پالپشتێ لسەر دەزگایێ بجهئینانا یاسا بۆیل دشێوێ (أ) دا، تو دشێی تێبینیا راستەییێ پلەکری لسەر سرنجێ بکەی، کوییێ نیشان کریە بسانتیمەترێت سێجا ( cc یان $cm^3$). و هەردوو ژی واتا سانتیمەترا سێجایە (سانتیمەترا سێجا دبیتە 1mL). ئەو دەزگایێ دیارکری دشێوێ (أ) دا یێ نیشانکریە بـ $cm^3$.

شیۆوێ (أ)

**2.** داڤا بەندکی هێدیکا بکێشە و پەمپێ ژ جهێ وێ بگرە. و پەمپێ بشیۆوێ بازنەی چەند جارەکا بلڤینە ژبۆ بساناهیخستنا لڤینا وی. قەبارێ تێزیك 0.1 cm$^3$ بکە. ئەڤی ئەنجامی دخشتێ پێزانینا دا تومابکە و وەسا دانە کو قەبارێ سەرەتاییە بۆ بارستە سفریێ سەنگێن بکارئینای.

**3.** ئێك ژ سەنگان دانە سەرپەمپێ. پەمپێ ب شیۆوێ بازنەی چەند جارەکا بلڤینە ژ بۆ ئاسانکرنا تەحسینا وی. و هەکو پەمپە گەهشتە دوماهیا لڤینا قەبارێ بخینە و دخشتێ پێزانینادا تۆماربکە بلا تێزیککری بیت بۆ 0.1 cm$^3$ .

**4.** پێنگاڤا 3 چەند بارەبکە و دوو سەنگا و سێ سنگا و چارسەنگا بکاربینە و ئەنجامان تومابکە.

**5.** پێنگاڤا 3 و 4 بکێمی دوو جارا دووبارەبکە، و ئەنجامان تومابکە.

خشتێ پێزانینا

| پەستان (بهژمارا سەنگا دیارکرینە) | پێکۆلا1 قەبارە ( cm$^3$ ) | پێکۆلا 2 قەبارە ( cm$^3$ ) | پێکۆلا1 قەبارە ( cm$^3$ ) |
|---|---|---|---|
| 0 | | | |
| 1 | | | |
| 2 | | | |
| 3 | | | |
| 4 | | | |

### پاقژکرن و رزگاربوون ژ بەرمایکی یا (گلێشی)

**6.** دوماهیا تاقیکرنێ، دەزگا و ئامێرا و جهێ کارێ خۆ لتاقیگەهێ بشۆ. و ئامێرا بزڤرینە جهێ وان یێ تایبەت. پرسیارا مامۆستاییێ خۆ بکە چاوا دێ خۆ ژ بەرماکیا رزگار کەی. دەستێت خۆ باش بشۆ بەری ژ تاقیگەهێ دەرکەڤی و پشتی تو کارێ خۆ بدوماهیك دئینی.

## ژمێریاری

1. **رێکخستنا پێزانینا:** تێکرا قەبارا پیڤای دهەرسیێ پێکۆلێن بارستا ژ 0-4 دیاربکە. ئەنجامان دخشتیێ پێزانینادا توماربکە.

2. **رێکخستنا پێزانینا:** قولپاندییێ تێکرا قەبارەیێن پیڤای دیاربکە. بۆ نموونە: ئەگەر تێکرا قەبارا سیێ بارستا **26.5cm3** بیت، دیێ **1/v =1/26.5/cm3 =0.0377/cm$^3$**

**خشتیێ پێزانینا**

| پەستان (بهژمارا سەنگا دیارکریە) | تێکرا قەبارێ ( cm$^3$ ) | قولپاندییێ قەبارێ V/1 ( × 01$^{2-}$/cm$^3$) |
|---|---|---|
| 0 | | |
| 1 | | |
| 2 | | |
| 3 | | |
| 4 | | |

## چەند پرسیار

1. **شرۆڤەکرنا پێزانینان:** شێوەکێ روونکری یێ قەبارێ بەرانبەر پەستانێ لسەر کاغەزا روونکریا لخارێ وێنەبکە، برەنگەکی هژمارا سەنگێن زێدەکری لسەر پەمپێ راستەوانە هاورێژەبیت دگەل ئەوی پەستانێ کاردکەتە سەر گازی. ژبۆ نواندنا پەستانێ، دشێی هژمارا سەنگا بکاربینی. تێبینی بکە پەستان لسەر تەوەرێ ئاسۆیی دهێتە وێنەکرن، و قەبارە لسەر تەوەرێ ستوونی دهێتە وێنەکرن. هێلا رۆنکرنێ ب رەنگەکی بکێشە کو پتر د خالان دا ببوریت.

2. **شرۆڤەکرنا وێنی رۆنکرنێ:** ئەرێ شێوێ رۆنکرنێ ئەوێ نیشاددەت کو گوهۆرینا قەبارێ راستەوانە هاورێژەیە دگەل گوهۆرینا پەستانی؟ ئەنجامێن خوّ شرۆڤەبکە.

---

---

---

